# پەرستار
Nurse



گۆڤارێکی تەندروستی و رۆشنبیریی گشتی وەرزییە
کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان دەریدەکات



وەزیری تەندروستی:
یەکێك لە خراپییەکانی ئەو سیستەمە نادروستەی ئێستای تەندروستی ئەوەیە کە نێوانێکی زۆر دروست بووە لە نێوان کارمەندی تەندروستی و پزیشکەکان و پەرستاراندا



دیمەن حوسێن بەڕێوەبەری ئامادەیی نەخۆشیاری کچان:
دانەمەزراندنی دەرچووانی ئامادەییەکەمانە بۆتە هۆی نەبوونی پەرستاری کارامە لە نێو نەخۆشخانەکاندا

ژمارە ٣

# ئەگەرەکانی بەردەم سەرکەوتنی پەرستاران و کۆمەڵەکەیان

کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان کۆمەڵەیەکی زانستی سەربەخۆیە ، بە پێی فەرمانی وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان بە فەرمانی وەزارەت ژمارە (٦٩٤) لە رێکەوتی ٢٠٠٥/٥/١٢ دەستی بە کارەکانی خۆی کرد ئەم دامەزراندنەی کۆمەڵەکەمان هاوکات بوو لەگەڵ بەرزڕاگرتنی یادی رۆژی جیهانی پەرستاران ، ئەمە تەنها بە بیرهێنانەوەیەك بوو بۆ پەرستارە بەرێزەکان ئەوەی گرنگە بەلای ئێمەوە ئەوەیە ئەگەر کاری پەرستاری لەگەڵ گیانی لەخۆ بردوویی و فیداکاری هاوڕێ نەبایە ئەگەر چاودێری کردن لە نەخۆش لەگەڵ شەونخونی هاوکات نەبایە ، ئەگەر بهای کارەکانی پەرستار بە مادده هەڵسەنگێنرابا ، ئەگەر میهرەبانی و پێکەنینی پەرستار لە تای تەرازو دانرابایە هیچ کاتێك رۆژێك بە ناوی رۆژی جیهانی پەرستاران دانەدەنرا. ١٢ /٥ ی هەموو ساڵێك هەڵبژێردرا بۆ ئەم رۆژە چونکە رۆژی لە دایکبوونی (فلۆرانس نایتینگل) ە لە ساڵی ١٨٢٠ زایینی کە پەرسارێکی بەریتانی بووە و یەکەم کەس بووە بناغەیەکی زانستی بۆ پیشەی پەرستاری داناوە بۆیە زانستی پێشکەوتووی ئێستای پەرستاری قەرزاری هەوڵەکانی ئەم خاتوونەیە کە بیری کردەوە وەك پەرستار چی بکات کە نەخۆش چاك بێتەوە و سەلامەتی خۆی بەدەست بهێنێت ، بۆیە هەموو ساڵێکیش کۆمەڵەی پەرستارانی جیهانی و پەرستاران بە گشتی لە سەرانسەری جیهان یادی ئەو رۆژە دەکەنە و کۆمەڵەی پەرستارانی نێودەوڵەتی هەموو ساڵێك دروشمێك دادەنێت کە ئەم ساڵ دروشمەکە بریتی بوو لە (دروستکردنی کەش و هەوایەکی گونجاو و یەکسان بە بەرزبوونی ئاستی چاودێری کردن و بایەخ دان بە نەخۆش ) ، ئەمەش مانایی ئەوەیە کە ئەگەر بێت و پەرستاران لە کەش و هەوایەکی گونجا و لەبار کار بکەن ، باشتر خزمەتی نەخۆش دەکەن ئەم کەش و هەوایەش زۆر لایەن دەگرێتەوە کە بریتین لە لایەنی زانستی ، ئیداری و زیاتر دەسەڵات پێدانیان و گرنگی دان بە لایەنی ماددی و رێزگرتن لە کەسایەتی یەکەی ئەمەیە نەهێنی سەرکەوتنی کارەکانی پەرستاران ئەگەر تێبینیش بکەن لە دروشمەکەش پێش هەموو شتێك بەرژەوەندی نەخۆش رەچاو کراوە کەواتە هێندەی پەرستار و کاری پەرستاری لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی نەخۆشدایە هێندە ئاڵۆدەی بەرژەوەندی یەکانی خۆی نی یە ، بەلام بەداخەوە لە کوردستان کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ کارکردنی پەرستاران نی یە چ لە دەسەڵاتی ئیداری یان دەسەڵاتی زانستی و ماددی. هەر چەندە پەرستاران خودی خۆیان دەتوانن گرنگترین رۆڵ ببینن لە پێناو بەدیهێنانی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ کارکردنیان لە رێگای ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆیان کە زانستی پەرستاری لەسەر شانیان داناوە بۆ نمونە گرتن و تۆمارکردنی نیشانەکانی زیندەگی (علامات الحیویە) کە بریتین لە پلەی گەرمی لەش ، ژمارەی لێدانی دڵ ، رێژەی فشاری خوێن و ژمارەی هەناسەدان ، ئەمە ئەرکێکی سەرتایی پەرستارە کە ئەنجامی بدات بەلام بەداخەوە چەند هۆیەك رێگر بوونە لەبەردەم ئەنجامدانی گرنگترین هۆکاریش ئەوەیە کە پەرستاران متمانەیان بەخۆیان نی یە و نایانەوێ ئەم کارە ئەنجام بدەن هۆکاری تریش نەبوونی متمانە لە لایەن پزیشکان بە کاری پەرستار و نەبوونی وەسفی کار (توصیف الوظیفی) بە شێوەیەکی فەرمی لە وەزارەتی تەندروستی و نەبوونی کەل و پەل و ئامێری پێویست ئەمە تەنها نمونەیەکی سادەیە و دەیان ئەرکی تری پەرستاری بەو شێوەیە پشت گوێ خراوە .

کۆمەڵەی پەرستارنی کوردستان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و هۆشیاری پەرستاران دامەزراوە ئەرکی کۆمەڵەکەتانە کە داکۆکی لەوە بکات کە ئەو مافەی دراوە بە پەرستار لە رووی زانستی یەوە بیکات دەبێت بێتەوە بەردەستی پەرستاران وە دەبێت پەرستارانی خۆشەویستیش ئەو ئەگەرانە وەلا بنێن کە دایان ناوە بێتە بەردەمیان لە کاتی هەڵسان بە کارەکانیان و دەبێت متمانەیان بەخۆیان و زانستەکەیان هەبێت لەبەرامبەریشدا دەبێت دەسەڵاتی تەندروستی ئەو مافە کەلە رووی یاسایی و مافی کردن بۆ پەرستاران بگێڕێتەوە ئەو کاتەش ئەگەرەکانی بەردەم سەرکەوتنی پەرساران زیاتر دەبن.



خاوەن ئیمتیاز

ژمارە ٣

# پەرستار
Nurse

گۆڤارێکی تەندروستی رۆشنبیری گشتی وەرزییە کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان دەریدەکات



## لەم ژمارەیەدا



ناونیشان / کوردستان / هەولێر / شەقامی (١٠٠) مەتری بەرامبەر تاپۆی دوو . ت ٠٦٦٢٥٦٢٢٥٣

# پەرستاران فریشتەی مرۆڤایەتین

سولتان محەمەد جولندی
جێگری سەرۆکی کۆمەڵە



لە سالانی ١٩٢١ کە وولاتی عێراق هاتە دروست بوون لە نەخۆشخانەکان چەند جۆرە کارمەندێک هەبوە وەک یاریدەری پەرستار و یان کوتێنەر (ملقح) ئەم خەلکە کە دادەمەزرا ئەگەر هەندێ خوێندەواری هەبوایەو زیرەک بوایە و هەندێ پزیشکی ئەوسەردەمەی ناسیبا و پاڵپشتێکی هەبوایە ئەوا دادەمەزراو ئیش و کارەکانیان تەنها دەرزی لێدان وکوتان دەبو لە دەرەوەی نەخۆشخانە بانگیان دەکرد بە دکتۆر و رێزی تایبەتی هەبوە لای خەلکی بەهەمان شێوە دکتۆرەکانیش رێزیان لێ دەگرت و یەکەم دامەزراندنی بەموچەی ١٤ دینار فەرمی و ٨ دینار سەختی گوزەرانی ژیان و ٢ دینار خێزانداری هەرمنداڵێک ٢ دینار تاکو منالی چوارەم دەبوە ٤ دینار ومندالی ٥ مانگی ٦ دینار خوا دەیکرد ٢٠ مندالی دەبوو . ئەو کاتە ئەم موچەیە بەشی خانەوادەیەکی دەکرد بەزیادەوە مانگانە ٢-٣ دیناری بۆ دەمایەوە سالانەش ٢ دیناری بۆ زیاد دەکرا ئەو کاتە کاری پەرستاری قورس بوو بلام کارمەندی باشی لێدەردەچوو چونکە ئەو کات سرنجی وەکو ئێستا نەبو (کانولا) ی ئاسنی هەبوو ئەویش بەشێوەیەکی زۆر کەم هەموی لەناو کولێنەر (ئامێری پاککردنەوە) دەکولێنرا بۆ پاکردنەوە و دانانی کەتینەری سوری کۆلێندرا و دانانی بەوازەلین و پاشان بە پلاستەر دەچەسپێنرا ، لەسالانی شەستەکان خول پەیدا بوو بووم بە پەرستار بۆ ماوەی ٣ مانگ لەسالانی ١٩٦٨ خولی پەستاری تەندروستی کرایەوە .

پەرستاری زۆر چاک دەرچوون لەسلانی حەفتا ١٢٠برین پێچی شۆرشی ئەیلول بوون پاش دانوستاندنی شۆرش لەگەڵ حکومەتی بەغدا بە بریاری بارزانی نەمر و پارتی دیموکراتی کوردستان ٥٠ برین پێچ بۆ هەولێرو ٥٠ برین پێچ بۆ سلێمانی و بۆ ماوەی ٦ مانگ خول بەباشترین پزیشک و مامۆستا خولیان ئەنجامدا لەگەل ئەو(١٠٠) پەرستارە ٢٠ پەرستاری تر بەشداریان لە خولەکە کرد بۆ ماوەی سالێک لە نەخۆشخانەی شاری سلێمانی وانەکانی پزیشکی هەناو و نەشتەرگەری و گوێ و لوت و تاقیگە و وانە زانستیەکانی تری پەیوەست بە بواری پەرستاری پاش کۆتایی خول بۆ ماوەی سالێک گشت قوتابیان بە پلەی زۆر باش دەرچوون وە لە شۆرشی ئەیلولیش لە پال وانەی پزیشکی و پەرستاری وانەی کوردایەتی و حزبیش هەبو ئەم پەرستارانە توانای بێ سنووریان هەبوو بۆ خزمەت کردنی پێشمەرگەو هاوولاتیان لەژن و پیاو منداڵ تاکو دروست کردنی ددان و دەرهێنان و زۆربەی ئەم برین پێچانە تاکو ئێستا کار دەکەن لە دەزگا تەندروستیەکان بەهەمان توانا بە شاهێدی هەموو پزیشکەکان کۆن و تازە لەهەمانکاتدا لە شاری هەولێرو سلێمانی نزیکەی ٥٠٠ قوتابی پەرستاری کچ هەبوو لە پۆلەکانی ٣/٢/١ سێ سالْ خوێندن و باشترین پەرستاری کچی لێکەوتوە و دابەش بوون بەسەر هەموو شارەکانی عێراق و هیچ جیاوازیەک نەبور لەنێوان کارکردنی کچان و کوران هەروەها کۆمەلگا هاوکاری هەموو پەرستارانی دەکرد و رێزی لێ دەنان لەبەر ئەوەی ئەوکاتە عەشائیری و بیری تەسکی ئاینی و حزبی نەبوو بۆ ئەوەی هێزی پەرستاری کەم بکرێتەوە تەنها یاسایەک هەبوو ئەویش خزمەت کردن و ماف وەرگرتن هەرچەندە ئەمرۆ ئاستی خوێندن لە پەیمانگاو کۆلێج زیادی کردوە بلام بەداخەوە ئاستی کارکردن و پابەندبوون بە یاسا لەبەر بوونی جیاوازی بیرو بۆچونی حزبی و عەشایری و بەرتەسکی لە روانگەی ئاینەوە کەهەردەم دین نەبوتە کۆسپ بەلام خەلکی بەم روانگە تەسکە سەیری نافرەتان دەکەن وەک پەرستار جاران هەر پەرستارێک خۆی بەرپرسیار بوو لەرووی یاسایەوە بەرامبەر بەیاسا بەلام ئێستا پەرستارێکی پەیمانگا یان کۆلێج پاش تەواوکردن زانستەکەی پیاوەکەی یان براکەی مامەلە لەگەڵ دامو دەزگاکەی دەکات وابزانم ئەم پەرستارە دەم و زمانی نیە بە تایبەت کە ئێستا باس لە ئازادی ئافرەت و رادەربرین و رێزگرتن لە ئافرەت و مافی مرۆڤ دەکرێت ئەوەی باسی پەرستار دەکات بەرگری لێ دەکات بۆ ئەوەی تەنها بەیانی کاربکات منالەکانی لە داینگە بەخێوبکرێن ئایا ئەگەر دایک و خوشکی هەریەکێک لەم کۆمەلگایە نەخۆش بێت دوای نیوەرویان شەوان پەرستارێک بەهەزار دوعا دەست ناکەوێت بۆ ئێشکگرتن و خزمەتکردنی نەخۆشخانە هەر هەمان لێپرساو لەکۆمەلگا لە مامۆستای زانکۆ مامۆستای ئاینی جوتیار کاسبکار دەلێن بۆ پەرستار نیە لەنەخۆشخانە ئەم حکومەتە ئەگەر هەموان هاوکار نەبین لە یاسا جێ بەجێ نەکەین کەسیش یاسا بە غەدر نەزانیت ئەو کاتە پەرستار پێش دەکەوێت و حکومەت پێش دەکەوێ میللەتیش ئێش و ئازاری کەم دەبێتەوە و دەبێ کۆمەلگا رێز لەیاسا بگرێت وە رێز لە پەرستار بگرێت چونکە ئەم پەرستارە بەشەو رۆژ لەجێگای دایک و باوک زیاتریش خەم خۆری نەخۆشە پەرستاری هیچی لەوانە کەمتر نیە کە شەهید دەبن لەپێناو وڵات پەرستاریش شەهید دەبێ لەپێناو مرۆڤایەتیدا .

# چالاکییەکان

- رۆژی١٢ ی مایس ( رۆژی جیهانی پەرستاران ) ە و هاوکاتیشە لەگەڵ ساڵیادی دامەزراندنی کۆمەڵەکەمان ، بۆ رێزگرتن لە پیشەی پەرستاری کۆمەڵەکەمان لەژێر چاودێری و بە ئامادەبوونی بەرێز ( بەرەڤان حمدی ) ...



سکرتێری یەکێتی قوتابیانی کوردستان ،لەمەراسیمێکدا خەڵاتی بەسەرقوتابیانی دەرچووی ساڵی خوێندنی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ (لە کۆلێژی پەرستاری . پەیمانگای تەکنیکی بەشی پەرستاری . ئامادەیی مامانی . ئامادەیی نەخۆشیاری کچان) دابەش کرد لە هۆڵی سەنتەری ئالا ،کە تیایدا وتاری هەریەک لە بەرێزان بەرەڤان حمدی سکرتێری ی.ق.ک. و سەرۆکی کۆمەڵە حەمدیە میرخان خوێندرایەوە .

- لەژێر چاودێری و بەئامادە بوونی رێزدار پشتیوان صادق بەرپرسی لقی ٢و بەهەماهەنگی لەگەڵ لیژنەی ناوچەی یەکی فەرمانبەران لەهۆڵی یەکی شوبات و بەئامادەبوونی کارگێرانی لق و بەرێوبەرایەتی نەخۆشخانەو بنکە تەندروستیەکانی ناو شاری هەولیر لە مەراسیمێکی شایستە دا خەڵات بەسەر زۆرێک لەپەرستاران دابەش کرا شایەنی باسە وتاری بەرێز بەرپرسی لقی دوو و سەرۆکی کۆمەڵە خوێندرایەوە.

- لە ژێر چاودێری بەرێوبەرایەتی گشتی فەرمانگەی تەندروستی دهۆک و بە ئامادەبوونی بەرێز بەرێوەبەری گشتی و بەرێوەبەرانی هەریەک لە نەخۆشخانەکانی ئازادی و فریاکەوتن رێورەسمی مەراسیمی یادی رۆژی جیهانی پەرستان لە هۆڵی نەخۆشخانەی ئازادی بەرێوەچوو ئەمەو لە مەراسیمەکەدا خەڵات بەسەر پەرستاراندا دابەش کرا

- رۆژی ١٢ ی مایس لە هۆڵی نەخۆشخانەی گشتی بۆ بەرزو پیرۆز راگرتنی رۆژی پەرستارانی جیهان لە هۆڵی نەخۆشخانەی گشتی سۆران مەراسیمی ئەم رۆژە بەرز و پیرۆز راگیرا و خەڵات بەسەر پەرستارانی ئامادەبوو دابەش کرا.

- نوێنەرایەتی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان لەناحیەی هەریر بەهاوکاری بەرێوبەرایەتی نەخۆشخانەی گشتی هەریر خەڵاتی بەسەر کۆمەڵێ پەرستاری ناوچەکەدا دابەش کرد

- هەر بە مەبەستی بەرز راگرتنی رۆژی جیهانی پەرستاران *لەبارەگای لقی سلێمانی کۆمەڵەکەمان بە ئامادەبوونی*



(محەمەد جلال) بەرپرسـی لقی سلێمانی کۆمەڵەکەمان کۆمەڵێ خەڵات بەسەر پەرستاراندا دابەش کرا.
.هەر لە درێژەی کاروچالاکییەکانی کۆمەڵەی پەرستارانی



ۆرک شۆپێک بە جیا بە جیا لە نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر بەناونیشانی (مافی نەخۆش) ئەنجامدرا کە تیایدا چەندین پەرستار ئامادەبوو گفتوگۆیان لەسەر بابەتەکە کرد .

.بە مەبەسـتی زیاتر ئاشـناکردن و لێک نزیکردنەوەی پەرستاران و گرنگیدان بە بواری وەرزشی کۆمەڵەکەمان



بە هاوکاری نەخۆشـخانەی هەولێـری فێرکاری خولێکی تۆپی پێی بچوکراوەی بۆ پەرسـتارانی بەشـەکانی ناو نەخۆشخانەی ناوبراو کردەوە.

. بـۆ زیاتر خسـتنەرووی زیانەکانی جگەرە کێشـان و برەودان بە تەندروسـتی هاوڵاتیان زنجیرە سیمنارێک بۆ بەرێز ماموسـتا (کریم فەتاح) ئەندامی دەسـتەی باڵای کۆمەڵەکەمـان ئەنجامدرا کەتیایدا ژمارەیەکی زۆر لە پەرستاران ئامادەی بوون .

.بە مەبەستی ڕێنمایی کردن و فێرکردنی دەزگا فریاگوزاری و ئەمنی یەکانی وەزارەتـی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردسـتان کۆمەڵەکەمان بە هـاوکاری فەرمانگەی ڕێنمانیی مەعنەوی سـەر بە وەزارەتـی ناوخۆ خولێکی فریاگوزاری سـەرەتایی تەندورسـتی بۆ (٤٥) ئەفسەرو پلەدارانـی وەزارەتی ناوخۆ کردەوە و تیایدا چەندین وانەی پراکتیکی و تیۆری لەسـەر فریاگوزاریە سـەرتایەکان پێشکەش کران شایەنی باسە خولەکە ماوەی هەفتەیەکی خایاند.

. بە مەبەسـتی ئاشناکردنی پەرسـتاران بە زانستەکانی



کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت کۆمەلەکەمان (٨) خولی یەک هەفتەیی بۆ نزیکەی (١٠٠) پەرسـتار کردەوە کە تیایدا چەندین وانە لەسەر چۆنی یەتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت پێشـکەش کران لە کۆتایی هەر خولێکیش بروانامە بەسەر بەشداریوان دابەشکرا.

- بۆ زیاتر سـوود وەرگرتن لە زانستی نوێی پەرستاری دوو خولی زانستی بۆ پەرسـتارانی یەکەی دەروونی لە نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری کرایەوە.



وەزیری تەندروستی:

# هەموو خزمەتێكی تەندروستی بەبێ خزمەتی پەرستاری ناتەواوە

**پرسی گۆڕینی سیستەمی تەندروستی و كێشە ناوخۆیەكانی وەزارەتی تەندروستی پرس گەلێكن لە مێژە مشتو مڕی زۆری لەسەرە بەهۆی ئەوەی وەزارەتی تەندروستی وەزارەتی خزمەتگوزارییەو پەیوەندی راستەوخۆی بەژیان و ئاسایشی تەندروستی كۆمەڵگاو هاوڵاتیانەوە هەیە بەو پێیە دەبێت زیاتر گرنگی پێ بدرێت و كێشەو ئاریشەكانی كەم بكرێنەوە بەڵام رۆژ بەرۆژ بەهۆی گەشەكردنی باری كۆمەڵایەتی و پێداویستی نوێ لە بواری تەندروستی بەردەوامیش ئەو وەزارەتە دەكەوێتە بەردەم داواكاری نوێ لەلایەن هاوڵاتیانەوە سەرباری ئەوەش لەنێو خودی وەزارەتی تەندروستی چەندین ئاستی جیاواز لە ستافی تەندروستی كاردەكەن وەكو پزیشكان و كارمەندانی تەندروستی و پەرستاران و..هتد، بەڵام تاوەكو ئێستا كاری ئەوانە هەموویان بە یاساو سیستەمێكی ئاوا رێك نەخراوە كە هەریەكەیان كارو ئەركی خۆی بزانێ و مافی خۆی بەپێی ئەركەكانی بدرێتێ بۆ باس كردن لەو كێشانەو چۆنیەتی چارەسەركردنی ، بەرێز وەزیری تەندروستی دكتۆر زریان عوسمان وەڵامی بەشێك لەو پرسیارانەی ئێمەی دایەوە كە ئەمڕۆ بەشێكن لە ئاریشەكانی ناو دەزگا تەندروستیەكان.**



دیمانە/ فاخر كرمانجى . دیلمان صلاح

**+ سەرەتا سوپاست دەكەین بۆ ئەم دەرفەتە ئێمە زۆر ناچینە سەر وردەكاری و ئەو خزمەتگوزاری و كێشانەی هەن لەوەزارەتی تەندروستی چونكە لەسەرەتای دەست بەكاربوونت تاوەكو ئێستا زۆر چاوپێكەتنت لەگەڵ كراوەو وردەكاری و زانیاری گرنگت باس كردووە بەردەوامیش لە وەڵامەكانت باسی ئەوەت كردووە كە گرنگی بەلایەنی خزمەتگوزاری دەدەی بەڵام ئەوەی تێبینیمان كردێت ئەوەبوو كە هەندێك جار رەخنەت لەهەردوو وەزیری پێشەخۆت لە هەردوو ئیدارەی حكومەت دەگرت بەهۆی نارێكی بەڕێوەبردنی كارەكانیان كە ئاماژەت پێ دەكرد بەڵام پێش ئەوەی جەنابتان ببن بە وەزیر ماوەیەكی زۆر لە دەرەوە ژیاون ئایا ئەو گرفتانەی لە وەزارەتی تەندروستی هەن ئایا پێت وانیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیستەمە نادروستەی وەزارەتی تەندروستی لە كوردستان.**

- من لەوەوە دەست پێدەكەم كە بۆ ماوەی (١٧) ساڵ لە بەریتانیا وەكو پزیشك كارم كردووە كە سیستەمی ئەوێ وابزانم لە ساڵی ١٩٢٥ دانراوەو تاوەكو ئێستا لەسەری دەڕۆن لەگەڵ رەوشی ژیانیش بەردەوام پێشكەوتووە. بەڵام لە عیراقدا هەر لەسەرەتاوە ئەو سیستەمە بە نارێكی دارێژراوە بەوەی كە هەموو بڕیارەكان دراوە بە وەزیر لە بچوكترین كارەوە تا گەورەترین بەرنامە، ئەمە یەك لەو هەڵانەیە كە ئەو سیستەمە تێی كەوتووە چونكە

ئێستا خزمەتی تەندروستی بەرفراوان بووە پێویستە لامەرکەزیەت بدرێتە خەڵک کە رۆڵی خۆی ببینێ ئەویش لەسەر بنەمای باوەڕ بەیەک بوون، بێگومان ئەوەی دروست بووە لەسەر بنچینەی بێ متمانەیی دروست بووە کە دەسەڵاتی تەواو دراوە بەکەسێک و هیچ دەسەڵاتێک نەدراوە بە خوارووی ئەو من رام وایە کە کاتی ئەوە هاتوە کە دەسەڵاتی تەواو بدرێت بە فەرمانگە تەندروستیەکان و ئەوانیش دەسەڵاتی تەواو بدەن بەڕیوەبەری نەخۆشخانەکان و ئەوانیش بە خوارووی خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن کارەکانی خۆیان بەرێکی ئەنجام بدەن ئەویش لەسەر بنچینەی متمانە بوون بەیەکتری، لە هەمان کاتیشدا چاودێری هەبێت و سزادان و لێپرسینەوە ئەنجام بدرێت بۆ ئەم مەبەستەش پێویستیمان بە گۆڕان هەیە گۆڕانیش دوو جۆرە یەکەمیان گۆڕانێکی رادیکاڵی دەبێت بەوەی کە سیستەمی کۆن هەمووی بەیەکجار لاببەین و هی نوێ پەیڕەو بکەین، دووەم یان هەنگاو بەهەنگاو ئەو سیستەمە بگۆڕین تاوەکو چەند ساڵێک وای لێبێت کە پەیوەندی نێوان پزیشک و کارمەندانی تەندروستی و نێوان وەزیرو پزیشک هەموو ئەوانەی کە لەو ستاڤە کاردەکەن باش بێت من پێم وایە کە گۆڕانێکی رادیکاڵی دەبێت بکرێت بەڵام بۆ کوردستان کە ئێستا ئەنجام بدرێت کاردانەوەی زۆری دەبێت بۆیە دەبێت گۆڕانەکان هەنگاو بەهەنگاوبێت هیوادارم لە ماوەی ساڵی رابردوو تاوەکو ئێستا توانیبێتم هەندێک گۆڕانکاری ئەنجام بدەم.

**+ بەکورتی دەمەوێت وەڵامی ئەو پرسیارەمان بدەیتەوە جەنابت کە بوویتە وەزیر گرنگترین ئەو کارانەی کە پێت وابوو ئەنجامی بدەیت چی بوو؟**

بەڕاستی کە ئەو ئەرکەیان پێ سپاردم کە من بە بەرچاوی خۆم گرتبوو ئەوەبوو کە یەکەم دەسەڵاتێکی تەواوم بدرێتێ،دووەم بودجەیەکی باش بدرێتە وەزارەت، سێیەم ئامانجم ئەوەبوو کە گۆڕانکاری بکەم. لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆرە لە دەرەوەم سیستەمی جۆراوجۆرم بینیوە،وەکو ئێران و لوبنان و سوریا و بەریتانیا و وڵاتانی ئەوروپا،بۆ ئەوەی بتوانم ئەو نارێکیانەی کە لێرە هەیە،چاک بکەمەوە و بەرو پێشەوەیان ببەم،بۆ ئەمەش بەڕێز سەرۆکی حکومەت زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە چەندین جاریش کۆبوونەوەی لەگەڵ کردووم و زۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر گۆڕینی سیستەمی تەندروستی،بەڵام بۆ گۆڕینی ئەو سیستەمە کارێکی یەکجار زۆری دەوێت، کە دەبێت هەنگاو بە هەنگاو بێت وەکو خواردنێک کە دەبێت بە پاروو بە پاروو قووتی بدەی، کە بەڕاستی هەموو بە جارێک لە توانای ئێمەدا نییە،هەر بۆ نموونە من لەگەڵ پزیشکە پسپۆڕەکان قسەم کرد بۆ زیاتر مانەوەیان لە نەخۆشخانە، ئەوانیش پێیان وتم ئەگەر بێتوو موچەمان دوو هەزار دۆلار بدرێتێ ئێمە ئامادەین لە بەیانی تاکو ئێوارە کار بکەین لە نەخۆشخانە،بەڵام تۆ حیسابی ئەوە بکە، بودجەیەکی یەکجار زۆری دەوێت،چونکە هەر پزیشک تیبە کارمەندی تەندروستی هەیە،چونکە ئەوانیش ئەگەر موچەیەکی باشیان بدرێتێ نۆرینگە لە کۆڵانەکان ناکەنەوە.چونکە موچەیان زۆر کەمە و بەشیان ناکات و ناچارن پەنا ببەنە بەر ئەو کارانە.

**+ ئێمە لەچاوپێکەوتنێک لەگەڵ وەزیری تەندروستی پێشوو،تێبینی ئەوەمان کرد،کە گلەیی ئەوەی دەکرد کە ئێوە بوون بە وەزیر،هیچ راوێژێکتان پێ نەکردووە بۆ ئەوەی بزانن، لەو وەزارەتە چی کراوە و یان چی دەکرێت و لەبەرنامەدایە بۆ داهاتوو،بەتایبەتی گلەیی لەوە دەکرد، کە جەنابت لە دەزگاکانی راگەیاندن گلەیی ئەوەت دەکرد کە پێش خۆت وەزارەت شتێکی ئەوتۆی نەکردووە، بۆ ئەوە چی دەڵێی؟**

- من بەداخەوە دەڵێم،من رێزم زۆرە بۆ بەڕێز د.جەمال عبدالحمید کە پێش من کاریان کردووە،من نەهاتوومەتە سەر سفر ئەوان لە پێش من شتێکی زۆریان کردووە،هیوادارم لەسەر ئەو شتانەی کە ئەوان کردوویانە بتوانم بینا بکەم بەرەو پێشی ببەم،هیوادارم بە هەڵە لێم تێ نەگەن،چونکە زۆرجار میدیای ئێمە شت بە هەڵە دەگوازێتەوە،یان بەشێوەیەک دەیخاتە روو،کە بەو شێوەیە نەگوتراوە.من پەیوەندی تایبەتیم زۆر باشە لەگەڵ هەردوو وەزیری تەندروستی پێشوو،من ٢٧ ساڵە پزیشکم،تەنها یەک ساڵە وەزیرم و تاوەکو کۆتایش هەر وەزیر نابم و هەر دەبینەوە پزیشک،بۆیە هەرگیز نەموویستووە لە کارەکانی ئەوان کەم بکەمەوە،ئەوەی من وتومە ئەوەیە کە دەڵێم،سیستەمی تەندروستی هەڵەیە من مەبەستم ئەوە نییە کە ئەوان هەڵەیان کردووە،منیش لەسەر هەمان هەڵە دەڕۆم،چونکە ئەوە هەشتا ساڵە لەسەر هەمان هەڵە دەڕۆین،سەبارەت بە راوێژ نەکردن بەوانیش ئەمەش بەشێکە لەو سیستەمە کۆنە کە هەیە بەداخەوە،لە دنیادا شتێک هەیە کە پێی دەڵێن(هاندۆڤەر) کە فەرمانبەرێک دەچێتە شوێنێک و شوێنی فەرمانبەرێکی تر دەگرێتەوە،بە جلوبەرگی خۆی دەچێتە ژوورێ و بەهەمان

جلوبەرگ دەردەچێت، فەرمانبەری نوێ کە دەچێت(هاندۆڤەر) ی پێ دەکەن و شوێنەکانی فەرمانگەی پێ نیشان دەدەن و پێی دەڵێن ئـەوە ژووری وەزیرە،ئەمە ژووری خۆتە و ئـەم پرۆژەیە کراوە و ئەمەیان ماوە،هەموو شتێکی پێ دەڵێن، لە بودجە و ژمێریاری ئەوەی خەرج کراوە و ئەوەی ماوە،من کـە هاتمە وەزارەت شارەزا نەبووم و کەسم نەدەناسی،یەک پزیشکم نەناسیوە،بڕوا بکەن نەمدەزانی وەزارەتـی تەندروسـتی لـە کوێیە و ڕۆژی یەکەم هاتم،ئۆتۆمبیلم نەبوو،بە تەکسـی هاتوچۆم کردووە،بە هەردوو وەزیر ئۆتۆمبیلێکیان جێ نەهێشـتبوو کـە هاتوچۆی پـێ بکەم،لیسـتی ئۆتۆمبیلەکانی وەزارەتیان بۆ هێنام لە بەرانبەرئۆتۆمبیلیوەزیرنووسراوە(نییە) .
لە سلێمانی ئۆتۆمبیلێکیان داینێ،وتیان ئـەوە ئۆتۆمبیل لـە سـلێمانی پێی نەگەیشـتمە هەولێر، لە ڕێگا شـکا، ئێمە بەو بارودۆخەوە هاتووین،بۆیە حەق نییـە، ئەو برادەرانـە گلەیی بکەن،لە جیاتی ئەوە دەبێت پشـتگیریم بکەن،تا دەگەڕێمەوە سـەر پێی خۆم،بەڵام من گلەییم نییە لەوان،دیارە سیسـتەمەکە وایـە چونکە لەوانەیـە کەس بانگی نەکردبن پێیان بڵێت سوپاس بۆ ئێوە کە تاکو ئێرەتان هێنا،ئیتر دەچیتەوە ماڵی خۆت یا خانەنشین دەبیت،شتەکان زۆر بـە خێرایی کران چاک خۆمان ئامادە نەکردبوو بۆ گۆڕانکارییەکان،خاڵێکی تری گرینگیـش کە دەبێت وەزیر تاکە کەسێک نەبێت کە هەموو نهێنییەکی گرینگـی لا بێت ئەمـە دەبێت بە پێی سیستەم بێت،ئەگەر وەزیریش بگۆڕدرێت دەبێـت هەمـان سیسـتەم هەبێت،ئەو خەڵکانـە بمێننـەوە کە لەو شـوێنە کار دەکەن،منیـش ئـەوەم کرد داوام لـە بەڕێوەبەرە گشـتییەکان کرد کە ئەو ژمـارە و ئامارانەی لایانە بمدەنێ بۆ ئەوەی سـوودیان لێ ببینم هەروەها



داوام لێکـردن کە پێـم بڵێن هەیکەلی ئـەم وەزارەتە چۆنـە و لە چی پێک دێت،لەبەرئەوەی من پێشـتر زانیاریم نەبوو،بۆیە زۆر جار خۆشـحاڵ دەبووم هەر یەک لەو برا وەزیرانەی پێشوو لێرە بانە و ئەو شتانەیان بۆ من شیکردباوە کە پێشـتر کردوویانە.من تەنها سوودم لەو کادیرانە وەرگرتووە کە پێشتر لێرە کاریان کردووە.

**+ لە مانگـی (٥) ئاگامـان لێبوو پەرلەمانی کوردسـتان پرۆژە یاسایی وەزارەتـی تەندروسـتی پەسـند کردو ئەکـرێ ئامـاژەی پێ بکـەن خاڵە گرنگەکانـی ئەو یاسـایە چی بوون ئایا پەیوەندیـان بەلایەنی کارگێڕییەوە هەبوو یان سەرەتایەک بوو بۆ گۆڕینی سیستەمی تەندروستی.**

- لەگـەڵ فراوانکردنـی وەزارەتـی تەندروستی پێشکەوتنی بواری تەندروستی ئەرکەکان زیاتر بوون هەروەها ئێسـتا چەند وەزارەتێکی تر زیـاد بووە وەکو وەزارەتی ژینگەو کۆمەڵایەتی ئەمانە بەشـێک بوون لە وەزارەتی تەندروستی بۆیە ئەم وەزارەتانە زیاد بوون پێویسـت بوو ئەو بەشانە بدرێتەوە بە وەزارەتەکانی خۆیان وەکو تەندروسـتی کرێکاران و تەندروستی پیشەیی بدرێت بە وەزارەتی کار هەروەهـا کۆمەڵێـک کاری زۆر گرنگتـر هاتووتە سـەر وەزارەتی تەندروسـتی کە پێشـتر نەبووە وەکو کۆنترۆڵی جۆری (سیطرة النوعیة) کە ئێسـتا لـە قۆناغـی تەواوبوون دایەو دەکەوێتە سـەر ئەرکی وەزارەتی تەندروسـتی کە هەر یەکێک شتێک لە دەرەوە بهێنێت دەبێت بەو تاقیگەیەدا تێپەڕبێت هەروەها بۆ نموونە کەسێک گەر بیەوێت کارگەیەکی دەرمان دابنێت مۆڵەتی لە وەزارەتی تەندروستی وەرگرێت ئەمانەو چەند شـتی تر کە نوێبوون و لەو پرۆژە یاسـایەدا هەبـوون کە لە لایەن پەرلەمانەوە پەسندکران ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە سـیفەتێکی گشـتی و یاسایی بدرێت بە ئەرکەکانی وەزارەتی

تەندروستی بۆ ئەوەی ئەرکەکانی جێ بەجێ بکات.

**+ ئەوەی بەدی دەکرێت لەناو نەخۆشخانەکان هەمیشە لە نێوان پزیشک و کارمەندانی تەندروستی جیاوازییەک هەیە تەنانەت شوێنی خواردنیشیان جودایە ئەمەش کاری کردۆتە سەر ئەوەی تێڕوانینی کۆمەڵگاش بەرامبەر بە کارمەندانی تەندروستی جیاواز بێت، ئەمە سیستەمێکە لەهیچ شوێنێکی دونیادا نییە جگە لە عیراق و کوردستان، ئایا ئەمە کارناکاتە سەر رادەی خزمەت کردن بە هاوڵاتیان سستی لە کارەکاندا؟**

- بەتاکید من زۆر لەگەڵتانم و پشتگیری قسەکانی ئێوە دەکەم یەک لە خراپیەکانی ئەو سیستەمە نادروستەی ئێستای تەندروستی ئەوەیە کە نێوانێکی زۆر فراوان دروست بووە لە نێوان کارمەندی تەندروستی و پزیشکەکان و پەرستاراندا تا وای لێهاتووە پزیشک بەچاوێکی سووک سەیری خوارووی خۆی دەکات، تەنانەت رازی نابن بەیەکەوە نان بخۆن و لەیەک شوێن دابنیشن، من ساڵانێکی زۆر لە دەرەوە کارم کردووە نەک هەر پزیشک و کارمەندو پەرستار بەیەکەوە نان دەخۆن بەڵکو خەڵکیش لەگەڵیان نان دەخوات و دادەنیشێ کە کافتریایەک هەیە لەهەر نەخۆشخانەیەک کارمەندانی تەندروستی و پزیشک دەچن نانی لێ دەخۆن بێ ئەوەی ئەو چێشتخانە بەلاش خانەنان لە نەخۆشخانەکان هەبن.

ئێمە نازانین چۆن بیسەپێنین لەسەر خەڵک کە دەبێت رێز لە کارمەندی تەندروستی بگرن، ئەمە شتێکە دەبێت دروست بێت لەناخی هەموومان هەرچەندە هەموو کارەکان لەیەک کاتدا نابن بەڵام کاری تەندروستی و خزمەتگوزاری تەندروستی بەتیم دەکرێت پزیشک بەبێ کارمەندی تەندروستی هیچی پێناکرێت هەروەها کارمەندانیش بێ پزیشک هیچیان پێ ناکرێت بەراستی کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو خەڵکە بیربکاتەوە کە دەبێت بگۆڕدرێن چونکە ئێمە تیمێکین بەیەکەوە کاردەکەین راستە سروشتی کارەکانمان جودایە بەڵام گشتمان تەواوکەری یەکترین و ئامانجی هەموومان خزمەتکردنی نەخۆشە، نەزۆربەی دونیادا لە نەخۆشخانەکان بەرپرسی قاوشەکان پەرستارن، من کاتێک ویستم پزیشک و کارمەندی تەندروستی تێکەڵ بکەم پزیشکەکان دەیان ویست دەوام بەجێ بهێڵن و رازی نەبوون کە لەیەک چێشتخانە بەیەکەوە بن، هەر پزیشکێک (٧٥)دۆلاری بۆ براوەتەوە لە بەرامبەردا خواردنی دەدرێتێ، کارمەندان هیچ پارەیەکیان بۆ تەرخان نەکراوە بەڵکو لە خواردنی نەخۆشخانە دەخۆن بەراستی من بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردەیە داوام کرد چێشتخانەی خانەی پزیشکان نەمێنێت بۆ ئەوەی سیستەمێکی عادیلانە دابنێین لەبەرامبەر ئەوەدا داوام کرد لەهەر نەخۆشخانەیەک کافتریایەک دابنرێت و ئەو پارەیە کە دەدرێت بۆ خواردنی پزیشکان بدرێت پێیان و بەو پارە خواردن بکڕن بۆ ئەو سەرمایەکیش بێت بۆ نەخۆشخانە هەروەها خەڵکیش مافی هەبێت لەو کافتریایە نان بخوات چونکە بەو شێوەیە زۆر ناڕێکی تێدا هەیە ئەو سیستەمەی ئێستا کەم و کوڕیەکی زۆری تێدایە زۆرجار پارەی (٣٠٠)پزیشک دەدرێت بە مقاولێک بۆ کڕینی خواردنی پزیشکان کە جاری واهەیە (٢٠)پزیشکیشی لێ نیە ئەی پارەی (٢٨٠)پزیشکی تر بۆ کێ یەو کێ دابەشی دەکات لە نێوان خۆیان بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردەیە بیرۆکەی من زۆر بەجێ بوو بەڵام بەداخەوە رەزامەندی لەسەر نەدرا بەڵام لەداهاتوودا هەر دێمەوە سەری چونکە سیستەمێکی عادیلانەیە.

**+ دەرماڵەی پزیشکان (١٥٠)هەزار دینار ئێشکگری شەوانە (١٠٠) دۆلاریان هەیە لە کاتێکدا بۆ کارمەندانی کچ ٢٥٠٠دینار و بۆ کوڕان ١٥٠٠دینار بۆ ئەمە چی دەڵێن؟**

- بەڵێ ئەگەر بەراوردی بکەین بە دەرماڵەی کارمەندی تەندروستی بەڕاستی زۆر کەمە چونکە مەترسی نەخۆش هەم لەسەر پزیشکان و کارمەندان کەم بەڵام دەرماڵەی ترسناکی وەرگرن بەڵام دیارە بەپێی مووچە حسابیان بۆ کراوە، سەبارەت بە ئێشکگری بەراستی بەڕاستی پارەی کارمەند زۆر زۆر کەمە لەبەرئەمەشە کارمەندان مەعنەویاتیان کەمەو نایەوێت کاربکات بەو پارەیە کە هیچ نرخێکی نەماوە، بەڵام ئایا زیادکردنی پارە بەدەست کێ یە بێگومان لەو رووە ئێمە سەر بە رێنماییەکانی حکومەتی عیراقین.

**+ پەرستاران هەر لە سەرەتایی دروست بوونی وەزارەتی تەندروستی گلەیی زۆریان هەبووە کە هیچیان بۆ نەکراوە ئێوە وەکو وەزیری تەندروستی نوێ دەتوانین شتێکی دڵخۆشکەر لێتان ببیستین سەبارەت بە گۆڕینی سیستەمی تەندروستی و ئاوڕدانەوەیەک لە پەرستاران؟**

- من پێت بڵێم گۆڕان کاری بە دوو شت دەکرێت یەکەم بە تەرخانکردنی بوودجە دەکرێت کە دەبێت زۆر چاک بزانن ئەم وەزارەتە لە ساڵی پارەوە تاوەکو ئێستا بوودجەی نەبووە یان بوودجەیەکی

دیاریکــراوی نەبــووە بۆ ئــەوەی ئێمە شــتێک دیاری بکەین یاخود دابنێین پێویســتمان بەپارە دەبێت بــۆ نموونە خولی بەهێزکردنی پیشەیی پەرستارییە گرفتەکان تەنها لە پەرســتاران نیە لە هەموو سیســتەمی تەندروستی هەیە، دووەم هەندێک شــت هەیە لە توانایی ئەنجوومەنی وەزیران دەبێت ئەوان بیکەن کە لەوانەیە هەندێک شــت هەبێت لە توانایی ئەوانیشدا نەبێت.

**+ پــەیــوەنــدیــتــان چــۆنــە لــەگــەڵ سەندیکاکانی تەندروستی بەگشتی و پزیشکان و تەندروستکاران بەتایبەتی ئایا گوێ لە سەرنج و تێبینییەکانیان دەگرن؟**

- بێگومــان ئێمــە هەماهەنگــی و کۆبوونەوەی بەردەوامان هەیە لەگەڵ سەندیکایی پزیشــکان و کارمەندانی تەندروستی، من لە پرسی داکۆکی کردن لە دەرماڵەی کارمەندانی تەندروســتی ئەگــەر بە ویژدانەوە قســەبکەین من یەکــەم کەس بووم پاڵپشــتیم کردووە داواکاری ئەوانم بەچەند نووســراوێک گەیاندۆتــە ئەنجوومەنــی وەزیــران، ئێســتاش لە پەیوەندی بەردەوام داین و هەفتانە لەگەڵ یەکتری دادەنیشین.

**+ کۆمەڵەی پەرســتاران و پیشــەیی پەرســتاری هەندێک جیاکاری هەیە لەبەرئەوەی ئاســتی پەرستاری جیاوازە و زانســتێکی ســەربەخۆیەو لقێکە لە زانستی پزیشــکی بەڵام تاوەکو ئێستا هەماهەنگــی یەک نەبــووە لە نێوان وەزارەت و کۆمەڵــەی پەرســتاران بۆ ڕێکخستنی ئەو پیشەیە؟**

- ئەمــە خەتایــی خۆتانــە کــە هەماهەنگیمان نییە خۆتان دوورە پەرێز گرتووە من خۆشــحاڵم ئەگــەر بێنە پێشــەوەو هەموو ڕۆژێک دەرگای من کراوەیە وەکــو چۆن لە ڕۆژی جیهانی پەرســتاران لەگەڵتان بــووم بۆ ئەوەی گوێتان لــێ بگرم و بزانــم گرفتتان چییە و پرۆژەتان چییە و چیتان دەوێت بۆ چاکــسازیکردنی بواری پەرستاری، من دەمەوێت یەک شتت پێ بڵێم ئەو سیســتەمە کۆنە کە وەزیرێک دێت ناتوانێت بیگۆڕێت چونکە وەزیر هەموو شــتێک نازانێ وەزیر ســوپەرمان نییە هەموو شــتێک لە بواری خۆی نازانێ هیچ لــە گرفتەکانی ئێوە نازانێ ئێوە دەبێت گرفتەکانتان دەستنیشــان بکەن و چارەســەری بۆ بدۆزنەوە و بەئێمە بڵێن تاوەکو پشتگیریتان بکەین.

**+ یەکێــک لەکارەکانــی کۆمەڵەی پەرستاران ئەوەبوو کە چەند سیمینارێک ئەنجامدرا لەسەر مافی نەخۆشی کە لە زۆربەی نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر ئەنجامدرا ئایا ئێوە لە نزیکەوە ئاگاتان لێ هەبوو؟**

- نەخێر بەداخەوە من لێرە زۆر سەرقاڵم ئێوەش نەهاتوون خۆتان بە ئێمە بناسێنن حەز دەکەم لەمەودوا زیاتر پەیوەندیمان هەبێت بۆ ئاگاداربوون لە کاروچالاکی ئێوە.

**+ ئیمرجنســی ئاکە نەخۆشــخانەیە کە کاری پەرســتاری بە شــێوەیەکی پرۆفیشــنال تیایدا جێ بەجێ دەکرێت ئایا لەبەرنامەتاندا هەیە نەخۆشخانەی لەو جۆرە بکەنەوە؟**

- بەڵــێ ئێمە لــە بەرنامەماندا هەیە کــە هــەر نەخۆشــخانەیەکی نوێ بکەینەوە لەســەر سیســتەمێکی نوێ لەناویدا کاربکەین بــۆ ئەوەی بتوانین وردە وردە هەموو شــتێک بگۆڕین لەبەرنامەشماندایە کە ئەو نەخۆشخانە نوێیانەمــان کردەوە بەشــێکی بدەینە خەڵکی بیانی و کارگێڕیەکی بیانی بۆ ماوەی ســاڵێک یان دوو ســاڵ تا ئەو کاتەی کارمەندانی خۆمان شــارەزایی کاری ئــەوان دەبــن پەنا بەخــوا لەو ماوەیە نەخۆشخانەیەک لە سلێمانی و یەکێکی تر لە ئاکرێ دەکەینەوە رۆڵی زیاتــر دەدەین بە پەرســتاران نیازمان وایە بەڕێوەبەری هەر قاوشــێک بدەینە دەرچووی کۆلێژی پەرستاری بۆ ئەوەی سەرپەرشتی بکات.

**+ پەرســتاران ســاڵانە دەنێردرێنــە پەیمانگاو کۆلێژی پەرستاری بەڵام خول کەم دەکرێتەوە بۆچی؟**

- نەخێــر خول کەم نییــەو بەردەوام لە سلێمانی بنکەی مەشق و ڕاهێنان هەیە بەهەمان شێوە دەمەوێت بنکەیەکی لە هەمان شێوە لە هەولێر هەبێت بۆ ئەوەی کارمەند بخرێتە نێو ئەو خولانەو ئێوەش دەبێت خۆتان بەو خولانە هەڵسن ئێمەش ئاسانکاریتان بۆ دەکەین.

**+ دوایین پرســیار جەنابتان لە ڕێگای گۆڤاری پەرســتار چی بە پەرســتاران دەڵێی؟**

- ســوپاســتان دەکەم هیوادارم توانیبێتم بەشــێک لە پرســیارەکانی ئێوە وەڵام بدەمەوە، بەداخەوە پەرســتاری لە وڵاتی ئێمە بەرەو پاشــەوە چــووە بە تایبەتی پەرســتاری کچان زۆر زیاتــر بوو لە ئێستا ئەمە جێگای نیگەرانیە چونکە هەموو خزمەتێکی تەندروســتی بەبێ خزمەتی پەرســتاری ناتــەواوە چونکە هەر بۆ نموونە کاتێک کە پزیشــکی نەشــتەرگەری کارەکــەی ئەنجامدا هەموو شتە گرانەکان دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ پەرستاری جێ دێڵێ، بۆیــە هیوادارم خەڵک زیاتر ڕووی تێ بکات و برەوی پێبدەن.

# نەخۆشی سارس

## Sars Syndrome Respiratory Acute Sever

م. كەریم فەتاح عەزیز - قوتابی دكتۆرا
ئەندامی دەستەی باڵای
كۆمەڵەی پەرستارانی كوردستان



نەخۆشـــی ســـارس یەكێكە لە نەخۆشیە ڤایرۆسەكانی سەردەم ، لە ســـاڵی٢٠٠٣ دۆزرایەوە و لە هەندێ وولاتی ئەورووپی بڵاو بۆوە وەكو ئەمەریكا و فەرنســا و چیـــن. هەروەهـــا رێكخراوی تەندروستی جیهانی WHO لە هەمان ساڵدا هەندێ راپۆرتی دەركرد دەربارەی هەبوونی ئەم نەخۆشیە و بەگرینگ زانینی چۆنیەتی خۆ پاراستن لێی. هۆكاری ئەم نەخۆشیە زۆر جۆرە ڤایرۆســە بەڵام تەنهــا جۆرێكیان تاكو ئێســتا دۆزراوەتەوە ئەویــش (Corona Virus) ئــەم جۆرە ڤایرۆســانە لە رێگــەی هەندێ گیان داری وەكو كەروێشــك و پشــیلە و بەراز دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ ، نیشــانەكانی بریتیە لە بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش تاكو ٣٨ ی ســەدی و لەرزو ژان و سەر ئێشەی لەگەڵ ، هەروەها سك چوون و كۆكەیەكی وشــك و هەناســە تەنگی و كــەم بوونەوەی رادەی ئۆكــسجین لە ناو لەشــدا بۆیە پێویست دەكات كە ئۆكسجین بە شــێوەیەكی میكانیكی وەربگری چونكە ئەم ڤایرۆســە هێرش دەبەنە سەر كۆئەندامی هەناســە وە ئەگــەر هات و ئەم نیشــانانە بــەردەوام بوون لە وانەیــە كۆتایی بەژیانی نەخــۆش بهێنی بەتایبەتــی ئەگەر بەرگری لەشی ئەوكەسە كەم بێ و رووداني هەوكردنی دووەمی Secoandary Infgection بەدوواوەبێت. گرینگترین رێگا بۆ چارەسەری خۆ پاراستنە لەگەڵ بەكارهێنانی هەندێك دەرمانی دژە نەخۆشــی Antibiotic بۆ نەهێشتنی رووداني هەوكردنە دووەمیەكان و بەكارهێنانی هەندێك دەرمانی دژە ڤایرۆس وەكــو Ribavirin . وە رێگاكانی خۆ پاراســتن بریتیە لە جیا كردنــەوەی تووش بوو بۆ مــاوەی (١٠ ) رۆژ هەروەها لەبەركردنی دەستەوانە و كەمامە بەتایبەتی لەلایەن نوژداران و پەرســتاران هەروەها بڵاوكردنەوەی رۆشــنبیری تەندروستی Health education بۆ گشت قوتابیان و كۆمەڵگە . چاودێری كردنــی ئــەو شــوێنانەی ئەگــەری بڵاوبونەوەی نەخۆشیەكەی لێدەكرێت وەكو فرۆكەخانە و شوێنە گشتیەكان و نەخۆشــخانەكان . هەروەكو هەموومان لە ســاڵی ٢٠٠٣ بینیمان كە چۆن كرداری كردنەوە بەردەوام بوو لەو شوێنانەی نەخۆشــیەكەی تێدا بــڵاو ببۆوە لە كەناڵەكانــی راگەیاندن باســیان لەچۆنیەتی خۆپاراستن دەكرد . لە كۆتایی ئەو رێو شوێنانەی دا هیوای لەش ساغی دەخوازم بۆ گشت لایەك.

سەرچاوە . ئینتەرنێت

**Schematic drawing of SARS coronavirus**




Source: Drazen JM[14]

# لەبەرچی شەکەت دەبین؟



وەرگێرانی لە فارسیەوە
ئاونگ حسین محمود
ئەندامی دەستەی باڵا

شەکەت بوونی لەشی مرۆڤ دەکرێت بە جۆرێک لە ژەهراوی بوون لە قەڵەم بدرێت ، ماسوولکەکان لە کاتی کارکردندا ترشی لاکتیک دروست دەکەن و ئەمەش دەبێتە هۆی ماندوبون ئەگەر بتوانین ئەم ترشیە لە ئەندامی شەکەت دەربخەین ئەم ئەندامە دووبارە هێزی نیش کردنی دەبێت و لە شەکەتی دەردەچێت .

لە درێژەی کاری ڕۆژانە ، لەشی مرۆڤ بە هۆی ترشی لاکتیک ژەهراوی دەبێت. لە لەشی مرۆڤ هەندێک ماددەی تریش هەن کە بە هۆی چالاکی ماسوولکەکان دروست دەکرێن کە بە ژەهراوی شەکەتی دەناسرێت ، خوێن ئەو ماددانە وەردەگرێت و لەگەڵ خۆی بۆ هەموو شوێنەکانی لەشی مرۆڤی دەبات ، لەبەر ئەوەش جگە لە ماسوولکەکان کە هەست بە شەکەتی دەکەن هەموو شوێنەکانی تری جەستەی مرۆڤ بەتایبەتی مێشک هیلاک دەبێت .



زانایان تاقیکردنەوەیەکی سەیریان ئەنجام داوە ، کاتێک کە خوێنی سەگێکی گەش و چوست و سەر زیندوو بە دەرزی لە سەگێکی ماندوو و هیلاک داوە راستەوخۆ شەکەتی سەگەکە لەناو چووە بە پێچەوانەوەش بە هەمان شێوە کە خوێنی سەگێکی شەکەت و هیلاکیان لە سەگێکی چالاک کردووە هەستی بە شەکەتی کردووە دەستی کردووە بە خەوتن .

شەکەتی تەنها کارکردنێکی کیمیاوی نییە بەڵکو کار کردنێکی بایۆلۆجیکیشە ، لە کاتی شەکەتیدا نابێ لەش ناچار بە کارکردن بکەین ، بەڵکو دەبێ لە خۆمان گەڕێین بۆ ئەوەی خانەکانی لەشمان بە تەواوی بحەسێنەوە ، تا نەتوانن هێزو ووزەی نوێ وەربگرن و دووبارە ئامادەی کارو چالاکی بن . خەو بە بەردەوامی بۆ مرۆڤ پێویستە چونکە خەوتن هۆکارێکە کە بە لەشی شەکەت وهیلاکی مرۆڤ جارێکی تر ووزە دەبەخشێت ، لە بارەی شەکەتی خاڵێکی سەیر ئەوەیە : ئەگەر بێت و کەسێک کە چەند کاتژمێرێک لە پشت مێزەکەی خۆی کار بکات و ماندوو بێت ، بەڵام شەکەتی دەرنەکات و نەیەوێت درێژە بکێشێت ، بەڵکو پێ ی باشتر بێت کە هەندێک پیاسە بکات یاخود کاتێک کە منداڵ لە قوتابخانە دێتەوە ، لە جیاتی نووستن و شەکەت دەرکردن یاری دەکات ، دەزانی هۆی ئەم کارە چیە ؟

هۆی ئەوەیە کە هەندێک جار تەنیا بەشێک لە لەشی مرۆڤ (دەست ، قاچ ، چاو ، مێشک) یەکێکیان شەکەت دەبن لەم کاتە دا باشترین ڕێگا بۆ لە ناو بردنی شەکەتی نیش کردنی بەشەکانی تری لەشی مرۆڤە ، لەبەر ئەوەی چالاکی بەشەکانی تر دەبێتە هۆی زۆربوونی هەناسە و سوڕانی (ڕەوتی هاتوچۆی) خوێن خێراتر دەبێت و گرێیەکان چالاکیان زۆرتر دەبێت ، لە ئەنجامدا ماددەی زیادی کە هۆی دروست بوونی هیلاکی لە لەشدان لە بەشەکانی شەکەت دەگوازرێنەوە و شەکەتی ئەم بەشە لە ناو دەچێت ، بەڵام ئەگەر تەواوی ئەندامانی لەش هەست بە شەکەتی بکەن ئەوا باشترین ڕێگا بۆ حەسانەوە خەوتنە.

# پیشەی پەرستاری و تێروانینی کۆمەڵگا

محسن جمیل خوشناو
بەرپرسی ڕاگەیاندن
ن ڕاپەرین . هەولێر

پیشـــەی پەرستاریزانســـتە و هونەریشە ، یەکێکە لە پیشە هـــەرە پیرۆزەکانی مرۆڤایەتی . کە هەموو کۆمەڵگایەک شـــانازی پێوە دەکات . بواری پزیشـــکی و تەندروستی بێ گومان دوو بـــواری گرنگ و خزمەت گوزاری مرۆڤایەتین وەلی پەرســـتاریش بۆتە ناوەندێک لە نێـــوان ئەم دوو بوارە خزمەت گوزاریە ، کە هاوکارو هاوشانە بۆ زیاتر پێشکەش کردنی خزمەت گوزاری پەرستاری و تەندروستی بێ گومان ئەرکی پزیشکیش بەبێ ڕۆلی پەرستار نابێت، پێویستە هەما هەنگ بن لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاســـتی رۆشـــنبیری و تەندروستی و هەڵبەتە پەرستار ئەو کەسەیە کە لەنێو کاری پەرســـتاری ڕۆل دەبینێت و بەو پەڕی دڵســـۆزی کارەکانی خۆی رادەپەڕێنی ئەگەر ڕۆژێک ســـەردانی نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی یەکەی دەبینی پەرستاران بەچ شێوەیەک خزمەت پێشکەش بە نەخۆش دەکات . بێ گومان هەمیشە ڕۆلیان بەرچاوە بەردەوام لەناو هۆلی نەخۆشـــەکان هامووشـــۆدەکەن بەو پەری دەست پاکی و دڵســـۆزی و خزمەت گوزاری تەندروســـتی پێشـــکەش بە نەخۆش دەکەن . ئەمە جگە لە لایەنی تەندروســـتی ، هەمیشـــە بەقسەی خۆش و مامەلەی نەرم و بەهەست و سۆزێکی پر لە میهرەبان سەردانی نەخۆش دەکەن و ئێش و ئازاری کەم دەکەنەوە و هەولی دوور خـــستنەوەی نەخۆش لەدڵ تەنگی و خەمۆکی دەدەن . ئەو کاتەی نەخۆش باری تەندروستی نارێکەو دوور لەماڵەوەیە ، بەڵام پەرستار وا لە نەخۆش دەکات کە هەست بەوە نەکات نەخۆشە و دوورە لەماڵ ، زۆر جار گوێ بیستی ئەوە بووین نەخۆش هەیە بەدەیان ڕۆژ و مانگ میوانی نەخۆشخانەیەو بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان هەســـتی بـــە نیگەرانی نەکردووە . ئەمەش دەگەڕێتەوە ســـەر دڵســـۆزی و دڵنەوایی پەرستار بەرامبەر نەخۆشەکە.

جا ســـەرباری ئەو هەموو خزمەتە جوانانەی پەرستاران کە شـــەو ڕۆژ ئامادەن خزمەت پێشـــکەش بەکۆمەڵگا بکەن بەڵام بەڕاستی جێگای داخ و هەلوەستەیە . چونکە هەندێ لە تاکەکانی نێو کۆمەڵگای کوردەواری بە چاوێکی نزم و بێ بڕوایانە ســـەیری ئەم پیشە مرۆڤاتیەو کاری پەرستاری دەکەن . تێروانیان خراپەو ئەم تاکە نارۆشـــەنبیرانەش لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا هەمیشە داخ لە دڵن و بەرامبەر هەردوو رەگەزی کورو کچ . بەشێوەیەکی تایبەتیش لایەنی رەگەزی (مێ) کچ . ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ نزمی ئاستی ڕۆشەنبیرو بەهەڵە تێگەشتن لەم پیشەیە مرۆڤایەتی یەو .وە دووا کەوتووی (بیرو هۆش) یان هەندێ لە تاکەکان وا بیردەکەنـــەوە کە لەســـەردەمی (چاخـــی بەردین) ژیان بەســـەردەبەن . نازانن دونیا گۆرانەو ژیان هەنگاو هەنگاو بەرەو پێش ئەچێت .

بێگومان هەر ئەم جۆرە تاکانەشـــن لەناو کۆمەڵگا کەمان کە تا ئێستا ڕێگرن لە ڕۆڵەکانیان ناهێلن.

بێنە نێوکاری پەرســـتاریو لەناو نەخۆشخانەکاندا خزمەت بکەن . ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆزێ باری تەندروستیان تێک بچێت راستەو خۆ ڕوو لە نەخۆشخانەدەکەن بەو پەری چاوشۆری سەر دادەنوێنن بەرامبەر پەرستاران .

بەڵام کەســـێک کە لە مانای پیشەی پەرستاری بگات بێ گومان بەو پەری دڵســـۆزیو ڕووخۆشـــی هەڵوێـــتی نیشان دەدات بەرامبەر پەرستار .

لێـــرەدا ڕۆلی (دایـــک و باوک) زۆر کاریگەرە لەســـەر ڕۆلەکانیـــان کـــە هانیان بدەن بۆ نێو کاری پەرســـتاری . جێگای داخە هەنـــدێ لەدایک و باوکەکان دووایی ئەوەی کچ یا کوریان پەرســـتاری تەواو دەکەن دەبنە ڕێگر ناهێلن لە نەخۆشـــخانە دابمەزرێن و گوایە کەســـایەتیان لەکەدار دەبێت . بەهەرحال ئەو کەسانە زۆرن کە ئامەزرۆی پیشەی پەرستارین بەڵام بەهۆی دوا کەوتووی هەندێ لە تاکەکانی نێو کۆمەڵگا ناتوانن بە ئاواتی خۆیان بگەن و لەڕێگەی ئەم پیشـــە پیرۆزە خزمەت بە مرۆڤایەتی و کۆمەڵگای خۆیان بکەن .

هیواداریـن کۆمەڵگای ئێمە چیتر بەم شێوەیە تێروانیان خراپ نەبێت بەرامبەر پەرســـتاران و هەمیشە بەچاوێکی بەرزو پڕ ڕێز ســـەیری پیشەی پەرســـتاری و پەرستاران بکەن چونکە هەموو کۆمەڵگایەک شـــانازی بەو کەسانەوە دەکەن کە لە ڕیزی کاری پەرســـتاری خزمەت دەکەن پەرستاری لەلای خۆشـــمان وا خەریکە پەرە دەســـێنێ و شان بەشانی پیشەی پزیشکی هەنگاو دەنێت و بەرەو پێش گوزەر دەکات.

# پشت ئێشە Backache

سلێمان عەبدولهادی
ن. هەولێری فێرکردن



پشت ئێشە یەکێکە لە نەخۆشییە بڵاوەکان، کە بەزۆری خەڵکی ڕووبەڕوی هەست کردن بەم ئازارە دەبنەوە لە قۆناغێکی ژیاندا، بەڵام بە خێرای ئازارەکە کپ دەبێتەوە بەبێ پێویست بوون بوون بە هیچ داودەرمانێک.
وە لەباری ئاناساییدا ئازاری پشتەکە بەردەوام دەبێت لە هەفتەیەکەوە تا دوو هەفتە، وە زۆر بەدەگمەن پێویست بەکاری نەشتەرکاری دەکات بۆ نەهێشتنی ئەم ئازارە.
پێک دێتو کەلە (٣٣) ئێسکVertebral column بربڕەی پشت
ئێسکێکیش دەوترێت برِبرِەو لەنێوان هەر بربڕەیەکو یەکێکیتردا کرِکرِاگە خەپڵەیەک هەیە، ئەو کرِکرِاگانە یارمەتی بربڕەی پشت دەدەن بەگشت لایەکدا بجوڵێتەوەو بربڕەکانیش بە ئاسانی بجوڵێوەو لێک نەخشێن.هەروەها لەگەڵ بەساڵاچووندا ئەم کرِکرِاگانە ڕەق دەبن و جیرییەکەیان کەمتر دەبێت، هەر لەبەرئەوەشە زۆر لە پیرەکان چەمانەوەی پشتیان لەلاگرانە.
هاوسەنگی لەشی مرۆڤ پشت ئەبەستێ بە بربڕەکانی بربڕەی پشت، بەڵام ئەرکی گەورە دەکەوێتە سەر ناوچەی ژێر پشت.
جوڵەی پشت لەباری ناهاوسەنگیدا، کتوپڕ یان هەر جوڵەیەکی هەڵە پشت ڕووبەڕوی هۆکاری خراپ دەبێت، وەک کرژبوونی ماسولکەکان، دڕان (وونجربوون) ی بەستەرەکان وە پەستان بۆ سەر جومگەکان، وە لەگەڵ ئەمانەشدا ئەیگەیەنێت بە پشت ئێشەیەکی توند، وە لە هۆکارەکانی تری پشت ئێشە هەوکردنی جومگەکان و دانیشتنی نارێک وهەروەها قەڵەوویش.

نیشاناکانی پشت ئێشە:

هەرچەندە کە لێرەدا هۆکاری پشت ئێشە وەک بەرزکردنەوەی شتی قورس یان دانەوینەوینەوەی کتوپڕ، وە لەلایەکی ترەوە لێرەدابەهۆی چەند هۆکارێکی دیارەوە ئازەرەکە گەشە دەکات بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک یان چەند هەفتەیەک.
وە هەمیشە هەست دەکرێت بەئازار لە بەشێکی بچوکی پشتدا یان لە ناوەند یان لە یەک تەنیشت.وە هەروەها هەستکردن بە ئازارێکی ڕۆشتوو بەرەو ڕان وە بەشی سەرەوەی قاچ، کەئەم جۆرەش ناسراوە بە ئازاری گۆڕاو.
ئەشێ ئەم هۆکارانە بە ئازار بێت لە کاتی وەستان بۆ ماوەکی درێژ یان دانیشتن لەبارێکی نارێکیدا یان دانیشتن لەسەر ڕایەخی خراپ، وە ئازارەکە دەگوزرێتەوە
بۆڕانەکان کە بەمەش دەوترێت ئازاری دەماری سمتی Actiatic – nerve ڕوئەدات لەئەنجامی ئازاری گۆڕاو یان پەستانی شوێنی یەکێک لە دەمارەکانی پشت.

# سەرەتایەک بۆ نەخۆشیزانی

ئامادەکردنی
عەشقی خەلیل
پەیمانگەی تەکنیکی هەولێر/ پەرستیاری

## PATHOLOGY



ئاشـــکرایە کە زانستی پزیشکی چەند لقێکی هەیـــە، جایەکێــک لەلقەکانی بریتییە لە نەخۆشیزانی.

**نەخۆشیزانی** (pathology)

بریتییە لەو زانستەی کە هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوەی قۆناغەکانی پەرەسەندن وگـــۆڕان لەنەخۆشیدا،وەتوێژینەوەی هـــەر گـۆڕانـکـاریـیـەکـی تـوێـکـاری anatomical،وکـیـمـیـایـی chemical،وکـــارئـــەنـــدامـــی physiological دەگرێتەخۆ کە ببێتە هۆی نەخۆشی لەزیندەوەراندا.

وشەی (pathology) لەبنچینەدا لەدوو وشەی گریکییەوە هاتووە( pathos ) واتە:نەخۆشییەکان (logy )واتە:زانست.

. لەڕێگەی نەخۆشیزانییەوە فێری ئەوەدەبین کەچۆن خودی کێشـــە تەندروستییەکان و بارە نەخۆشییەکان ، دیاری بکەین لە لاشەی مرۆڤەکەدا یان لەناژەڵی نەخۆشدا، هەروەها چۆن چارەسەری بکەین بە پەیڕەویکردنی هۆکارە پزیشکی و برینسازییەکان.

**تەندروستی** Health

پێویـــستە ئـــەو ڕاســـتییە بزانیـــن کەوا تەندروســـتی تەنها ئەوە نییە کە نەخۆشی لەلاشەدا نەبێت و بەس. بەڵکو ڕێکوپێکیی چالاکـــی و خۆراکیی گونجاو و ژیان لە ژینگـــەو بارو دۆخێکیلەبـــار و گونجاو و (دوور لەکێشـــەی لاشـــەیی عەقڵی و کۆمەڵایەتی) یش دەگرێتەوە.

**نەخۆشی** Disease

ئەو دۆخەیە کەبەسەر بوونە وەری زیندوودا دێت و وای لێدەکات کە لادانی توێکاری و کیمیایی و کارئەندامی لە بارێکی خراپدا ، تیایـــدا دەربکەوێت. یان بەشـــێوەیەکی تر بڵێیـــن بریتییە لە ئەنجامـــی نەمانی هارسەنگی لەنێوان خانەخوێ (المضیف)و ژینگەکەی یـــان لە نێوان خۆیو هۆکاری نەخۆشی.

**نەخۆشیزانی گشتی**
general pathology

ئـــەم زانســـتە لـــەو گۆڕانکاریـــە بنەڕتییانـــە دەکۆڵێتەوە کـــە دەبنەهۆی ئەوەی کەشـــانەکان تووشی نەخۆشی ببن، یـــان لێکۆڵینەوەی ئـــەو گۆڕانکارییانەی کەبە شـــێوەیەکی هاوبەش لە شـــانە یان ئەندامەکان ڕوودەدەن، بۆنموونە: مەیاندن thrombosis، بەستن-داخـــستن- embolism و شـــۆڕبوونەوەی(هاتنە خوارەوەی) چەوری fatty degeneration و زۆربوونـــی چـــەوری- بـــەز – fatty infiltration و بێنا گابوون – مەستبوون -amyloidosis تادوایی.

**نەخۆشیزانی تایبەتی**
special pathology

ئەم زانســتە لە جێبەجێ کردن و هێنانە دی هـــۆکارە بنەڕتییەکان دەکۆڵێتەوە کە پێشتر لەنەخۆشیزانی گشتی فێریانبووین و زانیاریمان لە بارەیەوە کۆکردۆتەوە لەسەر (نەخۆشـــییە تایبەتییە) جیـــا جیاکان ، وە لێکۆڵینەوەی(ئەو گۆڕانکاریـــانـــەی کە ڕوودەدەن لەبوونـــەوەری زینـــدووی وەک یەکەیەکی تەواوبوو (کوحدە المتکاملە)

دەگرێتە خۆ، وە ئەم زانستە پشکنینی کۆئەندامەکانی لاشەش بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دەگرێتە خۆ، وەتۆمارکردنی گۆڕانکاریەکان لەگشت کۆئەندامێک کە ببێتە هۆی نەخۆشییە جۆربەجۆرییەکان parasiticdiseases یان نەخۆشییە درمەکان infections diseases یان بەدخۆراکی malnutrition یان برین trauma .

**نەخۆشیزانی ئەزموونی**
**Experimental**

ئەم زانستە دەکۆڵێتەوە لە پەیدابوونی بەلاو نەخۆشییەکان lesions بە بەکارهێنانی ڕێگا تاقیگەییەکان. وە ئەم جۆرەی نەخۆشیزانی لە کاتێک دەست بەتوێژینەوە دەکات کە جۆرێکی دیاریکراو لە هۆکاری نەخۆشی لە بوونەوەری زیندوودا هەبوو (یان بێنرا) .

**نەخۆشیزانی بەرچاو یان دیداری**
**macroscopic or gross pathology**

ئەم زانستە لە پشکنینی بوونەوەری زیندوو دەکۆڵێتەوە بەهۆی تونکاریکردنییەوە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بە بێ بەکارهێنانی هاوێنکۆی گەورەکەر(microscope).

**نەخۆشیزانی دوای مردن**
**postmortem pathology**

ئەم زانستە لەپشکنینی بوونەوەری زیندوو دەکۆڵێتەوە دوای مردنی ئەم زانستە بەکرۆکی پزیشکی نوێ دادەنرێت .

**نەخۆشیزانی ووردبینیی**
**microscopic pathology**
**یان نەخۆشیزانی شانەیی**
**histopathology**
**یان نەخۆشیزانی خانەیی**
**cellular pathology**

ئەم زانستە لە پشکنینی شانە و خانە دەکۆڵێتەوە بە بەکارهێنانی Microscope واتە:ووردبین واباوە کە پشکینینی نموونەی ئامادەکراوو بۆیەکراو و جێگیرکراو، لەسەر سلاییدەکان بگرێتە خۆی.

**نەخۆشیزانی دیدەنیگەیی (السریری)**
**clinical pathology**

مەبەست پێی پشکنینی نەخۆشە لەکاتێکدا کەلەسەر خەوگە (السریر)دا بێت ،بەمەبەستی گەیشتن بە دیاریکردنی نەخۆشی ، ئەم زانستە ئەم پشکنینانە دەگرێتە خۆی : خوێن ،میز ،پاشەڕۆ ،...

**نەخۆشیزانیئاوێتەیی**
**mixture pathology**

ئەم زانستە تایبەتە بەلێکۆڵینەوەی گۆڕانکارییەکان لە دژە لاشەکان (دژە شتەکان ) antibodies کەتووشی زینەوەران دەبێت و لەئەنجامدا تووشی نەخۆشی دەکات .

**نەخۆشیزانی کیمیایی**
**chemical pathology**

هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوەی گۆڕانە کیمیاییەکان لە شلەو شانەکانی لاشەدا کە دەبێتە هۆی نەخۆشی بۆ نموونە لەکاتی ئاوسانی گورچیلەدا دەبێتە هۆی وەستاندنی هەندێ لەماددەکان وەک : نایترۆجینی ناپرۆتینی non protein nitrogen و نایترۆجینی یوریا urea nitrogen و کریاتینین creatinine ...تادوایی لە گورچیلەدا ، لێکۆڵینەوەی ئەو هۆکارانەی کە توانی ئاشکراکردن و دۆزینەوەیان هەیە بە بەکارهێنانی ڕێگە کیمیاییەکان.

**نەخۆشیزانی کارئەندامی**
**physiological pathology**

ئەم زانستە لە کارو فەرمانی ئەندامەکان دەکۆڵێتەوە وەکو : جوڵە motility و هەرس کردن digestion و دەرهاویشتن excretion و میتابۆلیزم metabolism...تادوایی.

**نەخۆشیزانی برینسازی**
**Surgical pathology**

ئەم زانستە دەکۆڵێتەوە لە وەرگرتنی نموونەیەک لە شانەی نەخۆش لەکەسەکێدا لەکاتێکدا کە لەژیاندا بێت وە پشکنینی نموونە وەرگیراوەکە لەژێر ووردبیندا بۆ زانینی خودی نەخۆشییەکە.

**نەخۆشیزانی بەرگری**
**immuno pathology**

ئەم زانستە لە گۆڕانە شێوەیی و فەرمانییەکان دەکۆڵێتەوە کە ڕوودەدات لە خانە خوێی هەستیاردا sensitizet host پاشگەیشتنی دژەپەیداکەر antigen و وڵامدانەوەی خانە خوێ مەبەست لە وڵامدانەوە بریتییە لە دەردانی دژەلاشەکان antibodies وە دەرکەوتنی خانە بەرگرییەکان.

**نەخۆشیزانی گەردیی**
**molecular pathology**

ئەم زانستە لە گۆڕانە شێوەیی و پێکهاتەییەکان دەکۆڵێتەوە کە لە خانەدا ڕوودەدات و دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەخۆشی ، گشت ڕێگە بەکارهێنراوەکان لەم لێکۆڵینەوەیەدا سوود بەخشن لە سەر ئاستی گەردی molecular level

**پشکنینی دوای مردن**
**postmortem examimation**

مەبەست پێی پشکنینی تاکەکەسە یان ئاژەڵ لەدوای مردن ،بەهۆی تونکاریکردنییەوە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک ،لە پزیشکی مرۆڤایەتیدا زیاتر زاراوەی ( autopsy ) بەکاردێت، بەڵام لە پزیشکی ڤێترنەریدا زیاتر زاراوەی ( neceopsy ) بەکاردەهێنرێت — بەمانای:ڕەوشتی تونکاری.

کیمیای ژیانی
**نەخۆشیزانیی**
**pathological bio chemistry**

مەبەست پێی لێکۆڵینەوەی گۆڕانەکانە لە پێکهاتەی شلە وشانەکان کەدەبێتە هۆی نەخۆشی.

**هۆکارزانی etiology**

لە ژماری داهاتور باسی دەکەین .گەر خوا حەزکات .

# دەتوانیت بەهۆی چەند خۆراکێکەوە سەدەیەک گەنج بیتەوە

سوهام عەلی
ن. هەولێری فێرکاری



هە نگاو بەهەنگاو زانیاری تەندروستی بەبێ دەرمان نەخۆشیە جۆربەجۆرەکان چاک دەکەنەوە یا لێ دووردەکەونەوە لە جیاتی چاک بونەوە.
خۆپاراستن باشترین چارەسەرە.
نهێنی ئەمەش لەجۆری خۆراکی مرۆڤدایە کە وردە وردە دەیدۆزێتەوە ئەگەر بە ڕۆژانە کەمێک بجوڵێت و میوەی تازەو پەرداخێک لە شەرابی سور بخۆیتەوە ئەوا بۆ ١٠٠ ساڵ دەژی.



لە ساڵی ١٩٠٣ دا ئەگەر ئازاری ماسولکەت هەبوایە زۆر خۆت بە بەختەوەر دەزانی کە تەندروستیت زۆر باشە، چونکە مردن زۆر بوو ئەگەر بکەوتیتایەتە ژێر نەشتەرگەری ئەوا ژیانت (مسۆگەر) نەدەبوو بەڵام یەک سەدە لە دوایی ئەوە تەندروستی زۆر بەرەو پێشەوە ڕۆشت، زۆر نەخۆشی لەناوچو و دەرمانی باش دۆزرایەوە و نەشتەرگەری ئەنجامی باش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە تەندروستی بەرەو پێشەوە دەڕوات هەندێک نەخۆشی تازەمان بۆ دروست دەبێت یا هەندێک نەخۆشی تا ئێستا چارەی بۆ نەدۆزراوەتەوە.
ئێستاپشکنینی بەدوای دەرمانی نوێدا زۆرە . بەڵام چەند خۆش دەبو کە کەسی نەکەوتایە ئەوسا تەواومان لەسەر چۆنیەتی ئە جیهانێکی پڕ ئارام دەبو. وەڵامی ئەم پرسیارەش ئاسانە . ئەگەر زانیاری تەواومان لەسەر چۆنیەتی ئیش کردنی کۆئەندامەکانی لەشمان هەبێت ئەوەش لەسەر خۆمان وەستاوە.

دەبێت خۆمان بەگۆڕەپانی زانیاری نوێوە بناسین و بزانین کۆئەندامی بەرگری و کۆئەندامی هەستیاری ڕژێنەکان چۆن ئیش دەکەن و چیان پێویستە ، بەم زانیاریانەش ڕێگای نەخۆشیەکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤ خۆی دەتوانێت زاڵ بێت بە سەریدا .
ئەویش جۆری خۆراکە کە لەم ساڵانەی دوایدا گرنگیەکی زۆریان پێ دراوە لەگەڵ وەرزش کردندا . کە مرۆڤ لە نەخۆشیەکانی دڵ و بۆریەکانی خوێن لەنەخۆشی شەکرە دور دەخاتەوە کە بە ملێونەها مرۆڤ بەدەستیەوە دەناڵێنن هەروەها نەخۆشی شێرپەنجە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بۆیان دەردەکەوێت کە پەیوەندی بە جۆری خۆراکەوە هەیە لە وڵاتە پێشکەوتوەکاندا دانیشتوانیان تەندروستیان زۆر باشە لەبەرئەوەی دەزانن چی دەخۆن و چۆن وەراش دەکەن ڕۆژی چەند وزەیان پێویستە و ڕۆژی چەند ڤیتامین بەکاردەهێنی یا دەتوانین بڵێین دەزانین چۆن کۆئەندامەکانیان کاردەکاو پێویستیان بە چیە ، بەڵام نیوەکەی تریان قەڵەون وزۆری نەخۆشیەکانی دڵ و شەکرەیان هەیە لە بەرئەوەی زۆر دەخۆن .

## ڕۆشتن و جوڵەی لەش

زۆر لە دانیشتوانی پێش کەوتوەکان بەیانیان زوو یان یان ئێواران دوای خۆر ئاوابوون ڕادەکەن یان ڕۆشتنی خێرا.
توێژەرەوە ئەمریکیەکانبۆین دەرکەوتووە کە پیاسەکردنی خێرا جوڵەیەکی تەندروستیە ئەم جوڵەیەش وەستاوە لەسەر :

ماوەی چەند ، چەند جار ، چەند توندو بڕۆیت. توندوتیژی وەرزش یان ڕۆشتنی لە هەموویان گرنگترە .
چوار تا پێنج جار لەهەفتەیەکدا ڕووبدا جاری لە ٣٠ خولەک کەمتر نەبێت وا لە دڵ و بۆریەکانی خوێن بکات بتوانێت ئاڵوگۆڕی مادەکان لەنێوان خانەکاندا بکا ئەمەش ڕوونادات تا لەو جوڵەیەدا تارەق نەکەینەوە.
بەڵام ئەوانەی قەڵەون نابێت بەبێ پرسی پزیشک ڕابکەن ڕۆشتنی خێرا دەبنە هۆی کەم بونەوەی پەستانی خوێن و خوێنی شل دەکاتەوە چونکە بە ڕۆشتنی خێرا خەپلە خوێنەکان کەمتر دروست دەبن کەواتە ٥٪ مرۆڤ ڕزگاری دەبێت لە جەڵتەی خوێن . لە لێکۆڵینەو میەکدا کەلەئەمریکا کراوە لەسەر ٧٠,٠٠٠ کەس ڕۆشتنی دووودرێژ هەفتەی ٢٠ سەعات ئەوا ٤٠٪ کەمتر توشی جەڵتەی دڵ دەبن .
ڕۆشتن و پیاسەکردن هەر ماسولکە بەهێز ناکات بەڵکو ئێسکەکانیشمان توندو تۆڵ دەکات چونکە بەڕۆشتنی ماسولکەی دەوری ئەژنۆ Artrose تایبەتی ئەو مرۆڤانەی ژانی ئەژنۆیان هەیە
بەهێز دەبێت توانای هەڵگرتنی لەشی مرۆڤ دەبێت .

### خۆراک و تەمەن

لەسەرەتای بیستەکاندا تەمەنی مرۆڤ لەدەوری ٤٧ ساڵیدا بو بەڵام ئەمڕۆ بەرزبۆتەوە بۆ ٧٦ ساڵ.
ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی تەندروستی جا چ دەرمان بێت یان دەرمان نەبێت یان خۆراک و ڤیتامینەکان و کانزاکان.
بەتایبەتی ئەو خۆراکانەی کە دورمان دەخاتەوە لە نەخۆشی شێرپەنجەو نەخۆشیەکانی دڵ.
ئەو خۆراکانەی کەمادەی دژە ڕەگی سەربەست( ئۆکسیدبوون ) فرێ دەدەن ، چەند جۆرێک لەوانە:
تەماتە: تەماتە بەکاڵی تەنیا سودی ڤیتامین(سی) هەیە بۆ لەش بەڵام تەماتە بەشێوەی کوڵاو یا دۆشاو یان سورەوەکراو یان شەربەت ی بەشێوەکانی دیکەی چەند مادەیەک دەردەدا کە پێیان دەڵێن (Anti oxidase)
. B جۆرێک لە ڤیتامین folium سپیناغ: ئەم پڕە لە ناسن و ترش چەوەس(ناوک): ناوک پڕە لە ڕۆن وەک ناوکی گەڵە بەڕۆژە یا بستە و ئەوانی دی . ئەم جۆرە چەوری لەخوێندا بەرز دەکاتەوە.HDL کۆلیسترۆڵی باش LDL خراپ ڕۆنە لە جۆری باشەو گۆلیسترۆڵی :ماسی دەریا جۆری زاڵم لەسەرو هەموو خۆراکێکەوە دادەنرێت چونکە ئەم ماسیە Zalm ماسی

Plankton سەوزەو قەوزەی ناو ناو دەخۆن و plankton گەورەکاان خۆراکیان ماسی پچوک و ئەوانیش ئەم مادەیەش دڵ و بۆریەکان دووردەخاتەوە acid omega 3 Fatty دەگۆڕن بۆ ترشە چەوری
لە نەخۆشی هەروەها کۆلیسترۆڵی خراپ کەم دەکاتەوەو خانەکانی مێشک دەپارێزێت دژی ئەلزایمەر. جگە لەم جۆرە ماسیە چەند جۆرێکی دیشیان هەیە وەک هارین .

Antibiotic سیر: سیر کۆلیسترۆڵی باش زیاد دەکات دڵ دەپارێزێت دژی بەکتریای زیان بەخش ، و هەندێک دەڵێن چارەسەری نەخۆش مەلاریاشە سپریش دەبێت بە وردی لەت کرێت یا بیپیشێنێ چونکە پارچەی گەورەو زۆر کوڵاندن سودێکی تەندروستی نامێنێت .

بوس بیس : ئەمیش جۆرێکە لەبەری درەخت لە کوردستاندا وەک تووترک یا بەلاڵۆک Bosbes
کە دژە ئۆکسانی تێدایە و لە نەخۆشی شێرپەنجەو دوورمان دەخاتەوە هانی بزوتنەوەی مێشک دەدات .

شەرابی سور : کەس نەی دەزانی بۆچی فەرەنسیەکان زۆر کەمتر لە ولاتەکانی دی دژی سەکتەی دڵ دەبوون ، دوایی بۆیان دەرکەوت کە دەگەڕێتەوە بۆ خواردنەوەی شەرابی سور . شەرابی سور دژە ئۆکسیدی تێدایە کە کۆلسترۆڵی باش زیاد دەکات ، کلس بۆری خوێن ڕادەماڵی و لە شێرپەنجە دورمان دەخاتەوە .بەڵام خواردنەوەی ڕۆژی لە یەک یا دوو پەرداخ زیاتر زیان بەخشە.

سەرچاوە:
گۆڤاری Health

# کارێ پەرستاری چیە ؟



**عیماد عومەر بەرواری**
**بەرپرسێ لژنا ڕاگەهاندنێ**
**کومەلا پەرستارێن کوردستانێ**

پەرستار کارمەندەکە یا ئەم دشێین بێژین وەکی هەر فەرمانبەرەکیە خوە ئەنجامدەت ئو رولێ خوە بینیت دناف کومەلێدا ئەم شێن بێژین بشەڤ و روژا کاردکەت یان ٢٤دەم ژمێرا کاردکەت دناف نەخوشادا ئەفجار چ نەخوشییێت ترسناکبن یان نەخوشییێ دیبێ دیسان هەردەم دەستێت وان دناف خوینێ دانە ئول لهەمی پشکا کاردکەن ملێ وان ب ملێ نوژداراڤەنە هەر پشکەکا هەبیت دناف نەخوشخانێدا..

دیسان لسەر دەمێ پێغەمبەری سلاڤێت خودێ لێ بن پەرستاری رولێ خوە دیتیە ئو بریندار دەرمان دکرن ئەگەر ئەم بهێین پسیارا مێژوییێ بکەین ل هەردو شورەشادا ئەیلول ئو گولانێدا پەرستاری رولێ نوژداری رابیە حەتا نوکە مە نمونەیێت هەین بێژنێ نوژدارێ شورەشێ لوان سەردەمادا هەکەر نوژدارەک هەبا لبارەگاییێ رینشتبو ئوهەردەم پەرستاربو بێ وان بێ پێشمەرگەیێ قەهرەمان ڤەبو. دگەل رێزگرتنێ بو هەمی نوژدارا بەلێ مێژوو وەتبێت کومەلا پەرستارێن کوردستانێ گەلەک ئوگەلەک درەنگی هاتە دەیناندن چونکی ڤیابیت تایبەت مەندیا خوە هەبیت بەرامبەر پەرلەمانێ کوردستانی ئەگەر ئەم سەرەدانا دەزگایێت شەهیدا بکەین ل سەرانسەری کوردستانێ دێ بینی گەلەک شەهید هەنە بەهراپتر کارمەندێ بسەر کومەلاڤەمەنە ئەز وەکو ئەندامەکێ کومەلا پەرستارێن کوردستانێ داخازێ ژ هەمی دەزگەهێت حکومی ئو حزبی ئو جەماوەری دکەم کو هاریکارێن ڤێ کومەلێ بن چونکی ئەڤ کومەلە ژنویای دایکبوی ئو یا ساڤایە جارەکدی ئەز سوزێ دەمە خەلکێ خوە ئەم خزمەتاوان بکەین مادەم ئەم بوینە خودان پارێزەر ئو ئەم بەرچاف هاتینە وەرگرتن بەرام بەری حکومەتا هەرێما کوردستانێ دیسان داخازێ ل وەزارەتا تەندروستی دکەین هەردەم رولێ پەرستاری بەرچاف وەربگریت چونکی کارمەندەکێ خەمخورە ئو هەر جهەکێ ڤالە داتگریت.

# کاریگەری تۆباکۆ (Tobacco) لەسەر تەندروستی مرۆڤ

صدیق ئەبوبکر



١- مرۆڤی جگەرەکێش ٢تا ٦جار زیاتر لە مرۆڤی جگەرە نەکێش گومانی لێ دەکرێت کەتووشی نۆرەی دڵ (Heart attack)یا ڕاوەستانی مێشک (Stroke) بێت .

٢- جگەرە کێشان ڕێژەی ترسناکی بەنەخۆشی شێرەپەنجە (cancer) زیاد دەکات لە ( دەم و قورگ و گەروو ، سورێنچک ، سیەکان ، گەدە ، پەنکریاس ، مەمک ، میزڵدان ، گورچیلە ).

٣- نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسەدان پەیوەندیەکی زۆری بەزیادبوونی ڕێژەی (Tobacco) لەناو خوێن هەیە ، وەکو نەخۆشی (سیل TB) و هەوکردنی بۆری هەوای درێژخایەن .

٤- پزیشکە نەشتەرگەریەکان ئەوەیان دەرخستوە کەئەوکەسانەی جگەرەکێشن ئەگەر هەر برینێکیان هەبێت ئەوا سارێژبوونی دوادەکەوێت بەهۆی کاریگەری ( Tobacco ) .

٥- جگەرەکێشان لەئافرەتاندا کاریگەریەکی زۆر خراپی هەیە لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە :

أ- ئەو ئافرەتانەی لەکاتی دووگیانیدا جگەرە بکێشێت ئەوا زیاتر چاوەڕوانی لەبارچوونی منداڵەکەی لێ دەکرێت (Abortion)یاخود منداڵێکی کەم کێش بێت(Baby with low birth weight) .

ب - پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان جگەرەکێشان لەکاتی سک پڕی و مردنی لەناکاوی منداڵدا هەیە .

ج - ١٠٪ مردنی منداڵ لەپێش لەدایک بوون لەوولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ کێشانی جگەرە لەکاتی دووگیانی دا .



٦- جگەرەکێشان لەپیاواندا دەبێتە هۆی لاوازبوونی توانای سێکسی (Impotence) .

٧- جگەرەکێشان چەندین کاریگەری تری هەیە لەسەر پیاوان و ئافرەتان ئەویش :

١- سەرئێشان (Headache) .

٢- کەم بوونی ماوەی تەمەن.

٣- سوربوونەوەی چاو ، قلێشانی قورگ (Soreness , sore throat) .

٤- نەزۆکی لەپیاو وئافرەتاندا (Infertility) .

٥- لاوازبوونی سیستەمی بەرگری لەش بەرامبەر بەمیکرۆب

٦- نەخۆشیەکانی گورچیلە

٧- زوو پەیدابوونی و بەدەرکەوتنی لۆچی دەم و چاو.

٨- برینداربوونی گەدەو دوانزەگرێ وهەوکردنی کۆلۆن .

(سەرچاوە) Scott .M.Grundy /MD/Phd.Themetabolic syndrome

# ئای دز AIDS

ستارگەردی
نەخۆشخانەی رزگاری / بەشی بینینی گەدە
(س. بەرنامەی تەندروستی و ژیان)

نەخۆشــیەکی ڤایرۆسیە هۆیەکەی ڤیرۆسی قەهقەریە (Retro Virus) تووشی بەرگری لەش دەبێت و دەبێتە هۆی لاوازبونی بەرگری لەش (مناعە جســم) ماوەی گەشــەکردنی ئەم ڤایرۆســە و دەرچونی نیشانەکانی (٦- ١٠)ســال دەخایەنێت ، لەم ماوەیە دەگوازرێتەوە لە توشبووێکەوە بۆ یەکێکی تر.

**هۆیەکانی گواستنەوە**

١-هۆکاری جووتبونی سێکسی لەنێوان پیاوێکی توشبوو لەگەل ئافرەتێکی ساغ یان بەپێچەوانەوە،یاخود پیاوێکی توشبوو لەگەل پیاوێکی ساغ.

٢- لەرێگای گواستنەوەی خوێنی توشبوو بۆ یەکێکی ساغ.

٣- بەکارهێنانــی کەل و پەلــی بەکارهاتوو بەخوێنی نەخۆشی توشبوو وەکو( سرنج و کەلوپەلی نەشتەرگەری ، ناوک برین، ئامێرەکانی مندالبوون)

٤- دایکێکی توشبوو بۆ کۆرپەکەی لەرێگەی وێلاشی دایک یــان لەکاتی لەدایکبوون یان کاتی شــیردانی منداڵەکە.

ئایــدز بەشــێوەیەکی گشــتی زۆرە شــلەی لــەش وەکو(خوێن،ئاوی نێرینە،ئاوی مێینە،شیری دایک)

**جۆرەکانی ئایدز**

١-کــورت خایەن(الحــاد) پاش تووشــبوونی لەش بە هەفتەیــەک نیشــانەکانی دەردەکەوێــت وەکو(تــا، نەستووربونی رژێنە لیمفاویە وەمل و ژێرباڵ، ماندووبون، سەرئێشان، ئاردقەکردن بەشەوان ،کۆخە)

٢-درێژخایەن(المزمن) پاش توشبوون بەم جۆرە نیشانەکانی پاش ٣ مانگ تا چەند ساڵێک دەردەکەون،

**نیشانەکانی**

زیاتر رژێنە لیمفاویەکان تووش دەبن

( ســکچونی بەردەوام،دابەزینی کێشــی لەش،هەست بەماندووبون، گێژی،توانای خواردنی نامێنێت،نەستووربوونی




فاتەرەشــە(کحال)، ئارەقەکــردن بەشــەوان،بێهێزبوونی مێشک،هەوکردنی دەم و لێوەکان، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ)

**نیشانەکانی کۆتایی**

١- شێرپەنجەی سنگ

٢- شێرپەنجەی رژێنی لیمفاوی

**چارەسەرکردن و خۆپاراستن**

**چارەسەرکردن :**

پێدانی نەخۆش بە ( دژە زیندەدەگی)

**خۆپاراستن :**

١- لەکاتی ئەنجامدانی کاری سێکسی.

٢. کاتی لەدایکبوونی منداڵ لەنەخۆشخانە.

٣- لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەری.

٤- لەکاتی دەرزی لێدان.

٥- ســونەت کردنی منداڵ بەرێگای راســت و درووســت.

# کێ خەم لەئێمەی دەرچوان دەخوات

**سامان سەعد عوسمان**
دەرچووی پەیمانگەی تەکنیکی
بەشی پەرستاری

وەک لای هەمووان ئاشکرایە خوێندن یەکێکە لەبنەما سەرکیەکانی پێشکەوتنی وڵات و مرۆڤ بۆ سەرکەوتن ،دیارە ئەم خوێندن و پرۆسەی فێربوونە پێویستی بەهەوڵ و تێکۆشانی زۆرە بۆ گەیشتن بە ئەنجام ، شایەنی باسە خوێندن جگە لەوەی مرۆڤ وەک خودی خۆی سودی لێ دەبینێت لەهەموو کاروباری ژیان دیارە دەرەنجامی تری لەدواوەیە ئەویش دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیان لەرێی ئەو بڕوانامەی کە قوتابی بەدەستی دەهێنێ دوای ساڵانێک لەهەوڵ و تێکۆشان و شەو نخوونی .

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە دیارە لە وڵاتی ئێمە دوای ئەو هەموو کێشەو دەردەسەریەی کە قوتابی دەیبینێ لەکاتی خوێندنەکەی کەچی دوای دەرچوونی ڕاکە راکیەتی بەدوای دامەزراندنی ، بۆ ئەوەی ئەم ڕەنج و کۆششەی کەچەندین ساڵە و تەمەنێکی تەرخان کردووە بێتە ئەنجام و بەرهەم و بتوانێت ژیانی خۆی پێ دابین بکات و لەلایەکی تریشەوە بتوانێت کارایی خۆی دەرببڕێ بۆخزمەت کردنی وڵاتەکەی .

بەش بەحاڵی خۆم یەکێکم لە دەرچووانی پەیمانگەی تەکنیکی، بەشی پەرستاری ، نزیکەی سێ ساڵە دەرچووم و تاکو ئێستا دانەمەزراوم و لەگەڵ یەکەمین ڕۆژی ئاهەنگی دەرچوونم بەدوای دامەزراندن گەڕاوم بەڵام بۆم نەکراوە بێ ئومێد بووم لەدامەزراندن ، نەک بەتەنها کەسێکی وەک من بەڵکو بە سەدەها پەرستاری وەک من ئێستاکە بەدوای کارێکی تردا وێڵە و دوورە لەو کارە مرۆڤایەتیەی (پەرستاری) کە بڕوانامەکەیەتی.بۆیە ئێستاکەش دڵ خۆشم بەوەی کە توانراوە کۆمەڵەیەک بەناوی (کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان) دابمەزرێت بۆ کۆکردنەوەی گشت پەرستاران .

لێرەدا گۆڤاری (پەرستار) بەدەرفەتێک دەزانم کەدەنگی خۆم و کەسانێکی وەک خۆم بگەینمە کەسانێکی بەرپرس ، بۆ ئەوەی بتوانرێت لەگەڵ دەرچوونی هەر پۆلێک (پەرستار) ڕاستەوخۆ دابمەزرێن و جێگەیان لەنێو نەخۆشخانەکاندا بۆ بکرێتەوە ، بتوانن ماندوبوونی چەندین ساڵەی خوێندنیان ببێتە بەرهەم بتوانێرێت خزمەت بە وڵاتەکە و خەڵکی کوردستان بکات .

# چەند نەخۆشیەک کە تووشی کۆئەندامی هەناسەدان دەبن



محەمەد جەلال
بەرپرسی لقی سلیمانی
کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان




## هەوکردنی سیەکان pneumonia

ئەو کەسەی کە توشی هەوکردنی سیەکان ببێ، پلەی گەرمی لەشی زیاد دەکات و کۆکە و بەڵغەمی خوێناوی لەگەڵە وە تەنگە نەفەسیەکی زۆری دەبێت کە پێویستە کرداری بە هەڵم کردنی (ventilation) بۆ بکرێت بە مەبەستی شل کردنەوەو دەرهێنانی بەڵغەم ئەگەر نەخۆشەکە بە زووی چارەسەر نەکرێت لەوانەیە تووشی دوو مەلی سیەکان ببێت Lung abscess

## هەوکردنی پەردەی سیەکان pleurisy

زۆربەی کات گەنجەکان تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن ،هیچ مەترسیەکی توندی نیە دوای ماوەیەک چاک دەبیتەوە بەڵام هەندێ جار نەخۆش توشی تەنگە نەفەسی دەبێت و مەترسی کۆبونەوەی ئاو لە پەردەی سیەکاندا هەیە . ئەم بارە بە پشکنین (تیشک ) (chest x-ray) دەست نیشان دەکرێت ، لە وڵاتی ئێمە دا هۆی سەرەکی ئەم نەخۆشیە سیلی سیەکانە ، لەبەر ئەوە پێویستە زوو نەخۆش رەوانەی پزیشکی پسپۆر بکرێت . باشتر وایە پێش رەوانە کردن خەپلەی ئەسپرین یان ئەندوسید گولاج یان هەر بەدیلێکی تر وەربگرێت .

## گرژبوون یان کۆلنجی ماسوولکەکانی قەفەزەی سینگ chest wall pain due to muscular spasm

هەندێک جار ماسوولکەکانی دەوری قەفەزەی سنگ و پەراسووەکان گرژو ڕەق دەبن و جوولەی ناو قەد یان بە فشاری دەست ئازارەکە زیاد دەکات ، ئەمە لە کاتێک دا کە تەندروسی نەخۆشەکە باشەو هیچ نەخۆشیەکی تری نیە ، ئەم ئازارە مەترسی نیە با دەرمانی دژی ئازار وەک ئەسپرین یان برۆفین وەربگرێت بە پێ ی پێویست ، هەروەها شێلان سودێکی زۆری هەیە بۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکان.

## رەبۆ asthma

لە ئەنجامی فرە هەستیاریەکی زۆری بۆڕی و بۆڕیچکەکانی توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت ، کە دەبێتە هۆی تەسک بوونەوەی بۆڕی و بۆڕیچکەکان ، هەروەها تەنگە نەفەسیەکی زۆرو سەریەشەیەکی توندی لەگەل دایە ، پێویستە بە ووردی چاودێری ئەو کەسە بکرێت کە رەبۆی هەیە ،هەروەها پێویستە بوخاخی سالبیۆتامۆل یان خەپلەی سالبیۆتامۆل یان ئەمینۆفلین بەکار بهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نۆرەی تەنگەنەفەسی سەخت (acute attack)

## جەڵتەی سیەکان pulmonary infarction

زیاتر لەو کەسانە روو دەدات کە نەشتەرگەریان بۆ دەکرێت دوای نەشتەرگەریەکە ناتوانن بجولێن بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر جێگا دەمێننەوە بە تایبەتی لە نەخۆشی بە تەمەندا و یان نافرەتی سکپڕ یان ئەوانەی نەشتەرگەری کلۆتی سمت یان پرۆستاتیان بۆ دەکرێت ، ئەوەش دەبێتە هۆی

مەبینی خوێن لەخوێنهێنەرەکانی قاچ وحەوزدا ،پێویستە نەخـــۆش بە زووترین کات ڕوانەی نەخۆشـــخانە بکرێت چونکە پێویســـتی بەدەرمانـــی دژە مەبینی خوێن هەیە ،وەک دەرزی هیپاریـــن وخەپلـــەی وارفارین ،هەروەها پشوودان وبەکارهێنانی دژە زیندەگی (ئەنتی بایۆتیک) بۆماوەی ١٠ ڕۆژ.

## شێر پەنجەی بۆریەکانی هەناسە

bronchogenic carcinoma

زۆربەی کات ئەو نەخۆشانە جگەرە کێشی درێژ خایەنن وچەند ساڵێکە لەسەر جگەرە کێشان بەردەوامن .ئەوانەی تووشی شێرپەنجەی سیەکان دەبن کێشیان کەم دەکات وکۆکـــە وبەڵغەمـــی درێـــژ خایەنیان هەیـــە ،لەوانەیە بەڵغەمەکەیان خوێنی پێـــوە بێت هەروەها لەگەڵ تەنگە نەفەسی و خیزەی سیەکان ..

## سیلی سیەکان pulmonary t.b

هەر نەخۆشێک لە ســـێ هەفتە زیاتر کۆکەی هەبێت ، کۆکەی خوێنی پێوە بێت ئەوا پێویســـتە بیر لەبوونی نەخۆشی سیل بکرێتەوە بەتایبەتی ئەگەر پێشتر تووشی ئەم نەخۆشیە بووبێت یان کەسێکی نزیکی تووشی ئەم نەخۆشیە بووبێت ، نەخۆش جگە لەبێ هێزی ودابەزینی کێـــش وکەمبوونـــەوەی خواردن ونەرمـــە کۆکەیەکی بەردەوام تووشـــی ئەرمە ئارەق کردنەوەی شـــەوان دەبێت لەناوجێگا.دەستنیشانکردنی ئەم نەخۆشیە بە تیشک x-ray دەکرێت لەگەڵ پشـــکنینی بەڵغـــەم بۆ بەکتریای چیلکەیی ســـیل کە پێی دەوترێ sputum for analysis acid fast bacilli.

## تەنگە نەفەسی دەروونی

hyper ventilation syndrome

زۆربەی نەخۆشەکان گەنجن (بەتایبەتی مێینەن)،نەخۆش زۆر بەخێرایی هەناسە دەدات بەڵام وا هەست دەکات کە ســـنگی هەوای تێ ناچێت قاچ ودەستیان ساردەوئارەقی سارد دەکەنەوە لێویان ســـڕ دەبێت ،خیزەی سنگیان نیە، شین بوونی لێو و ســـەرەپەنجەکانی نیە ، سەریان قورسە وهەناسەدانیان قوڵە و هەوا بەئاسانی دەچێتە سیەکانەوە ،لێدانی دڵیان خێرایە و بەڵام فشاری خوێنیان ئاساییە..

## چەند ئامۆژگاریەکی بەسوود

١- ئامـــۆژگاری نەخۆش بکرێـــت ئەگەر جگەرە کێش بوون وازی لێ بێنێت یان زۆر کەمی بکەنەوە..

٢- خواردنەوەی شلەمەنی زۆر.

٣- بەکارهێنانـــی دەرمانی فراوانکردنی بۆریچکەکانی هەناسەدان بەپێ ی پێویـــست ..

٤- زوو زوو هەناسەی قووڵ هەڵمژێت لەهەوایەکی پاکژ وتەمییز..

٥- دابەزاندنـــی تا ئەگەر هەبوو بەهۆی ســـارد کردنەوە وئەنتی پایرۆڵەوە ..

٦- ئەگەر کێشی زۆربوو ئامۆژگاری بکرێت کە کێشی دابەزێنێت..

٧- خۆ پاراستن لە سەرما..

٨- دوورکەوتنە لە شـــوێنی تاریک وشێدار کە تیشکی ڕۆژی بەرناکەوێت..

# زیرەکی ئەکادیمی و زیرەکی ویژدانی

سەنگەر محەمەد



لەدەرئەنجامی توێژینەوە زانستییەکانی دواساڵەکانی سەدەی بیستەم و سەرەتایی سەدەی (٢١) دەرکەوت ئەو جۆرە یاساو هاوکێشەیەی بۆ دیاری کردنی زیرەکی مرۆڤ بەکاردێت تەواو نیە بەلکو جۆرێک لە کەم و کوری تێدایە ، بەڵگەش بۆئەوە زۆرکەس لەئەنجامی تاقیکردنەوەو پێوانی زیرەکیان دەردەکەون ئەوکەسانە زۆر زیرەکن و رێژەی زیرەکیان لەئاستێکی زۆر بەرزدایە ، بەڵام لەهەمان کاتدا کەسانێکی‌تەندروست نینە وە بەدەست کۆمەڵێک کێشەی دەروونی دەناڵێنن.

(گۆلمان Golman) کەیەکێکە لەزانا دەروونزانەکان بەگومان بوو لەوەی کە بەتەنها زیرەکی ئەکادیمی ببێتە هۆی سەرکەوتن وکامەرانی و بەختەوەری لەژیاندا جا بۆ تاقیکردنەوەی ئەم بۆچوونەی ژمارەیەک توێژینەوەی زانستی لەسەر ژمارەیەکی زۆر قوتابی زانکۆ بەناوبانگەکانی ئەمەریکا بەئەنجام گەیاند .

بۆ ئەم مەبەستەش قوتابیانی زانکۆی (هارڤارد) ی هەلبژارد سەرجەم ئەم توێژینەوانەی لەسەر قوتابیە زۆر زیرەکەکان ئەنجامدا ،کەرێژەی زیرەکیان بەپێی پێوانە زیرەکیەکان ئاستی زیرەکیان زۆر بەرزبوو دوای‌لێکۆلینەوە (گولمان) ی دەروونزان بۆی دەرکەوت:

١- ئەوقوتابیە زۆر زیرەکانە دوای دەرچوونیان لەژیانی کارکردنیان سەرکەوتوو تر نەبوون لەقوتابیەکانی تر ئاستی زیرەکیان کەمترە .

٢- ژمارەیەکی زۆر لەو قوتابیە زیرەکانە بەختەوەرنەبوون لەژیانیان و هەستیان بەبێزاری و دلتەنگی دەکرد .

٣- زۆربەی قوتابیە زیردەکان لەژیانی کۆمەڵایەتی و ویژدانی سەرکەوتوو نەبوون

لەدەرئەنجامی ئەم توێژینەوەیە (گۆلمان) بۆی دەرکەوت کە زیرەکی ئەکادیمی بەتەنها هۆکارنیە بۆ سەرکەوتن و بەختەوەری مرۆڤ ، بەلکو مرۆڤ پێویستی بەجۆرێکی تر لەزیردکی هەیە بۆ سەرکەوتن و بەختەوەری تەواو ئەم جۆرە زیرەکییە بریتی یە لە زیرەکی هەلچوون(Emotional Intelligence)زانایان (مایر Mayer) و (سەلوڤی Salovey) زیردکی هەڵچوونی بەم شێوەیە پێناسە دەکەن (کە بریتی یە لە توانای چاودێری کردنی هەست و هۆش و هەڵچوونە تایبەتییەکانی خودو کەسانی تر ، تاکو لە یەکتر جیابکرێنەوە ،ئەم زانیاری و شارەزاییەی لەئەنجامی ئەو چاودێری کردنە دەست دەکەون بۆ مەبەستی ئاراستە کردنی بیرو هۆش و کارو چالاکیەکانی )

بۆ ئەوەی زیاتر لەزیرەکی هەڵچوون تێبگەین تکایە وەڵامی ئەم چەند پرسیارەی خوارەوە بە (بلێ) یان بە (نەخێر) بدەوە :

١- هەندێک جار هەست بە وەڕسی و بێزاری دەکەم بەبێ ئەوەی بزانم بۆچی وابێزارم .

٢- چەنــد هەوڵ بدەم بێ ســوودەو هەر هەندێ کەس تووشی پەستی و تورەییم دەکەن .
٣- دەزانــم هەموو کەس گرفتی خــۆی هەیە بەڵام گیروگرفتە دەروونیەکانــی من زۆر ئاڵۆزن و وەک هیچ کەسێکی تر نیە .
٤- هەر چ کاتێک تووشــی کێشە و گرفت ببم ئەوا بەهۆی سەرنەکەوتن و نەزانی خۆمەوەیە .
٥- لەوکاتانەی پێویســتی بەدەربرینی هەست و سۆزی خۆشی و رێزگرتن و خۆشەویستی هەیە من هەست بە خۆشی و ئارامی ناکەم
٦- کاتێک بمەوێت کاروچالاکییەک بکەموئامانجێکم بێتــەدی ئــەوا کۆمەلێک گیروگرفت و بەربەســت لەبەردەمــم قیت دەبنەوە ناهێلن ئــەم کاروچالاکییە ئەنجام بدەم تاکو ئامانجەکەم بهێنمەدی.
٧- هەست بەبێزاری و دووبارە بوونەوەی ژیان دەکەم .
٨- بەبێ ئەوەی هیچ هۆکارێکی دیاری کراو هەبێت ، هەست بەماندووبوون و بەدبەختی دەکەم .
٩- بەردەوام پێویستیم بەلایەنگری و دەستخۆشی کەسانی تر هەیە بۆ ئەوەی رازی ببم لەو کارو چالاکیانەی کە دەیانکەم .
١٠- بۆ ئەوەی کارەکانم بەســەرکەوتوانە تەواوبکەم پێویستم بەپاڵ و هێزی کەسانی تر هەیە .
ئەگەر وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە (بەڵێ) بوو ئەوە تۆ کەسێکی ، پێویستیت بە زیرەکی هەڵچوونی هەیــە و ئــەو جۆرە کەســانەی کەدلتەنگی و خەمۆکی و دڵەراوکــێ و ڕاڕایی هەڵچوونی ، بەسەردا زاڵە و ســەرەرای ئەوەش ناتوانێت وەک پێویســت ، پەیوەنــدی کۆمەلایەتی ســەرکەوتوو لەگەڵ کەســانی تردابنێ و لەخۆشت و کەسانی ترو ژیان بەگشتی بێزاری و هەست بە ئارامی و دلنیایی ناکەیت .
واتــە بوارەکانی ســەرکەوتن و کامەرانی لەبەردەمدا تەســک و سنوردارەو وەک هی ئەوکەسانە نییە کەپێچەوانەی ئەو هەستەی تۆیان هەیە و زیرەکی هەلچوونی لەلایان بەهێزە .
کەواتە زیرەکی هەلچوونی بریتی یە لە :
کۆمەلێک تایبەتمەندێتی کەســایەتی ، کەپەیوەندن بەبوونی شــارەزایی و لێزانی و زانیاری کۆمەلایەتی و ویژدانــی کە یارمەتی تــاک دەدەن بۆ ئەوەی لەباری دەروونــی خۆی و هەســت و ســۆزو هەڵچوونەکانی کەســانی تر تێبگات ، دواتر هەست بەئارامی دەروونی و خۆسازاندنی کۆمەلایەتی بکات .
بەبروایی زۆر لەدەروونزانان هەرکەسێک خاوەنی زیرەکی هەلچوونــی بێت ئــەوا دەبێت بەخاوەنــی کۆمەلێک تایبەتمەندی و ســیفات کەیارمەتــی دەدەن بۆ ئەوەی ئەمانەی خوارەوەی هەبێت :
١- توانایــی پەیداکردنی هاورێ و بەردەوام بوونی ئەو هاورییەتیە .



٢- لەکاتی لێقەومان و تەنگانەدا هاوخەم و هاوبەشــی ئازارەکانی ئەو کەسانەیە .
٣- توانای کۆنترۆڵ کردنی هەلچوونی و گۆرانکارییە و ویژدانییەکانی هەیە .
٤- دەتوانێت بەئاسانی گوزارشت لە هەست و سۆزەکانی بکات .
٥- لەکێشــەو گرفتی نێوان کەســانی تر تێدەگات و دەتوانێت بەئاسانی کێشــەو گیروگرفتەکانی نێوانیان چارەسەر بکات .
٦- رێزی کەســانی تر دەگرێ و دەشــتوانێ هەلیان بسەنگێنێ . .
٧- دەتوانێت ببێتە مایەی رێزوســۆز و خۆشەویســتی کەسانی تر .
٨- دەتوانێت خۆی بخاتە شــوێنی کەســانی تر وەک خاوەنەکانیان هەست بەئازارو گرفتەکانیان بکات .
٩- لەبریارو راو بۆچوونی و تێگەیشــتنی شــتەکان سەربەخۆیە و حەز بە پاشکۆیی ناکات .
١٠- دەتوانێت خــۆی لەگەل بارودۆخی نوێ و گۆران کارییەکانی بگونجێنێ .
١١- بەوپەری متمانەو بروا بــە خۆبوونەوە رووبەرووی بارودۆخ و کێشــە و گرفتــە ئالــۆزو زەحمەتەکان دەبێتەوە.
١٢- لەکەش و هەوا و شــوێن و کاتی خۆشدا ،هەست بەئارامی و کامەرانی دەکات .

کەواتە ئێستا دەتوانین بلێین کە زیرەکی ویژدانی بریتی یە لە کۆمەلێک ئاکار و تایبەتمەندی کەســایەتی کە یارمەتــی مرۆڤ دەدات بۆ ئــەوەی کۆنترۆلی هەلچوون و گۆرانکاریــە و ویژدانی و مەزاجیەکان بکات ، بۆ خزمەتی خــۆی و تاکەکانی تر بەکاریان بهێنێ و دواتریش لەژیانی تایبەتی و گشتیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ .
ئینجا ئەگەر مــرۆڤ بیەوێت لەژیان ســەرکەوتن بەدەست بهێنێ ئەوا دەبێت رێژەیەکی پێویستی لە زیرەکی هەلچوونــی (ویژدانی) لەتەک زیرەکی ئەکادیمی و گشــتی وەک (بیرکردنەوەی مەنتقی و تێگەیشتن و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان و بریاردانی گونجاو و یادکردنەوە و شــیتەل کردنی گرفتەکان و .... هتد ) هەبێت ، واتە هیچ یەکێک لەو دووزیرەکییە (زیرەکی هەلچوونی و زیرەکــی ئەکادیمی و عەقلی ) بەتەنها ناتوانێت مرۆڤ بەختەوەر بکات .
ئەوەی مایــەی گەشــبینی و لێوردبوونەوەیە زیرەکی هەلچوونی وەک زیرەکی ئەکادیمی و عەقلی پەیوەست نییە بە بۆماوەو لەتواناداا هەیە لەرێگەی کۆمەلێک چالاکی و راهێنانەوە گەشەی پێ بکرێ و بۆ خزمەتی تاک و کۆمەڵەکەی بەکار بهێنرێ .
دەرئەنجامی زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کەدەتوانرێت لەرێگەی ( دروست کردنی گەشەپێکردنی هەست و سۆز و خۆشی و بەزەیی پێداهاتنەوە و رێزگرتنی بەرامبــەر و رووبەرووبونــەوەی گرفــت وقەیرانەکان بەشێوەیەکی هێمن و دوور لەهەڵچوون و چارەسەرکردنی گرفت و کێشــەکان بە دیالۆگ و ئاشتیانە ...هتد) گەشــە بەزیرەکی هەلچوونــی منداڵەکانمان بدەین ، بۆیەخێــزان و قوتابخانــە دەتوانن لەرێگــەی یاری و کۆمەلێک چالاکی هــەر لەمنداڵیەوە تاکو قۆناغی هەرزەکاری و گەورەبوون لەسەر خاسیەت و مۆرکەکانی ( ئارامی و خۆراگری و کۆڵنەدان و بەرگەگرتن و رازی بوون بەسەرنەکەوتن و دووبارە هەوڵدان بۆ سەرکەوتن و رزگاربوون لەخۆپەرستی و هاندان لەسەر هاوکاری .... هتد ) رابهێنن چونکە لەداهاتوودا ئەو خاسیەتانە دەبن بە کۆڵەکەو بنەمای زیرەکی هەلچوونی تاک .

له کتابی (سایکۆلۆژیای گشتی )
بەدەسکاریەوە وەرگیراوە .

# چارەسەری سەرەتایی بۆ پێوەدانی مارو دووپشک



سۆران حەسەن قادر
ئەندامی لقی سلێمانی
کۆمەڵەی پەرستارانی
کوردستان



لە کاتی گەستنی هەر مێرویەکدا پێویستە زۆر هێمن بین و خۆمان نەشلەژێنین، بیر لە چارەسەری سەرەتایی گونجاو بکەینەوە چونکە لە کاتی ئارامیدا توانای کارکردنی باشترو زیاترت هەیە.

## لەکاتی چارەسەری پێوەدانی ماری ژەهراوی :

١- ئەو بەشەی کە مار گەستویەتی، هەرچەندە ئەو بەشەت جولاند ئەوەندە بڵاو بونەوەی ژەهرەکە لە لەشت دا زیاد دەکات، هەر کەسێ مار بەقاچی یەوە دا، لەسەرپێی پەتی تەنها هەنگاوێکیش بە پێکانی نەروا، پێویستە بە تەختەی جولاو بجولێت.

٢- بەشی سەرەوەو خوارەوەی بەشە گەستراوەکە بپێچەو زۆر توندی مەکەو هەموو نیو سەعات جارێک بۆ ماوەیەکی زۆر کورت خاوی کەرەوە.

٣- ئەگەر دەرمانی دژی ژەهرەکەت دەست کەوت ئەوا لە پێکراوەکەی بدە لەگەڵ وریا بونێکی باش بۆ ئەو رێنماییانەی لەسەری نوسراوە هەموو چارەسەری دژی هەستەوەری وەرگرە بۆ ئەوەی ئەم دەرمانە کاریگەر بێت، پێویستە دەرمانی دژی هەستەوەری بەکار نەهێنیت ئەگەر لە (٣ کاتژمێر) زیاتر بەسەر مار پێوەدانەکە دا تێپەر ببوو ئەمەش بەپێی ترسناکی جۆری مارەکە دەگۆرێت وەکو ماری (کوبرا).

٤-ئەگەر سەهۆلت لابوو ئەوا بەپەلە تووشت بووەکە واتە شوێنی گەستنەکە بە پەرۆیەکی پڕ سەهۆل بپێچەوە.

٥- ئەگەر نیشانەکانی هەوکردن بەدیار کەوت ئەوا پەنسلین بەکار بهێنە. پاشان بەزوترین کات پێویستە بگەیەنرێتە نەخۆشخانە.

## لەکاتی پێوەدانی دووپشک:

مەترسیەکانی ژەهراوی بوون بە پێوەدانی دووپشک جیاوازە واتە هەندێکیان لە هەندێکی تریان زۆر ترسناک ترن.

پێوەدانی دووپشک لەسەر مرۆڤی پێگەیشتو زۆر ترسناک نیە ئەگەر تەنها حەبێکی ئەسپرین وەرگرێ یان هەندێک سەهۆلی بخەیتە شوێنی پێوەدانەکە، یان دەرزیەکی (ئەمیتین)ی لەچوار دەوری پێوەدانەکە ئارادیەکی باش ئێشەکە کەم دەکاتەوە، یان کەمێک ئاوی سارد خستنە سەر شوێنی پێوەدانەکە لەوانەیە ئازارو ئاوساویەکەی کەم بکاتەوە، ئەمەش دوو هەفتە یان چەند هەفتەیەک یاخود مانگێک بمێنێتەوە.

بەڵام ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە پێنج ساڵ کەمترە لەوانەیە پێوەدانی دووپشک زۆر ترسناک بێت، بەتایبەتی ئەگەر پێوەدانەکە لەسەر یان لە لەشی بێت، لەهەندێ وڵاتدا هەندێک دەرمانی دژە پێوەدان هەیە، بەڵام ئەم دەرمانە پێویستە لە ماوەی دوو کاتژمێردا وەری بگرێت.

حەبی ئەسپرین یان پاراستوڵ بەکار بهێنرێ بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکە، ئەگەر هەناسەی منداڵەکە وەستا پرۆسەی هەناسە پێدانی دەستکرد لە دەمەوە بۆ دەم بۆ گەڕانەوەی هەناسە ئەنجام بدە.

# گرنگی چاودێری کردن لە کاتی دووگیانی

حەمدیە میرخان ئەحمەد
قوتابی دکتۆرای پەرستاری

لە ئامۆژگاریەکانی WHO

دایکی خۆشەویست ئەگەر لە کاتی دوو گیانی گرنگی بــە خۆت بدەیت دەتوانی بە دلنیایی و بە ئاســانی ماوەی دووگیانی خۆت تــەواو بکەی و خاوەن منداڵێکی جوان و ژیکەلە بی.

چاودێری کردن لە کاتی دووگیانی دەبیتە هۆی دۆزینەوەی بارۆدۆخی مەترسیدار وەک خۆین بــەر بوون (نزیفی)، التهابــات، بەرز بوونی فشــاری خوێن، منداڵ بوونی بە زەحمەت. وەشتەکانی تر.

ئەگەر هاتوو تــووشی بارودۆخێکی مەترسیــدار بــووی دەتــوانــی زوو چارەسەری بکەی پێش ئەوەی تووشی باری خراپتر ببیت.

بەرێک و پێکی ســەردانی بنکــەی تەندروســتی زۆر گرنگە.

یەک یان دوو جار سەردان بەس نیــە بۆ دیار کردنی گیروگرفتەکان.

بەرێک و پێک سەردانی پزیشک کرەن دەبیتە هۆی دیاریکردن و چارەســەرکردنی زۆربەی گیروگرفتەکان.

لەکاتی ســەردان ئــەم کارانەی خوارەوە بۆ تۆ ئەنجام دەدرێت

• وەرگرتنی زانیاری لە دایک و پێشــکنینی جەستەیی بۆ دیاری کردنی ئەو بارۆدۆخەی کە پێویستە بایەخەکی زیاتر و وردتر پێ بدرێت یان چارەسەر بکریت.

• پێدانی حەبی ئاسن و فولات بۆ رێگرتن و چارەسەرکردنی کەم خۆینی.

• کۆتان لەدژی کۆزاز بۆ پێشــگیری کردن لە روودانی کوزاز لە منداڵ.

• ناردنی دایک بۆ لای پزیشــکی پسپور ئەگەر گیر و گرفتی هەبێت.

• پێوانی فشاری خوین.

• پێوانی کێش.

• پشکنین لە لایەن پزشکی ددان.

بارۆدۆخ و نیشــانەکانی مەترسی دار لە کاتی دووگیانی ئەمانەی خوارەوەن:

١ - تەمەنی کەمتر لە ٢٠ ســاڵ یان زیادتر لە ٣٥ ساڵ.

٢- ئــەو ئافرەتانــەی کە بۆ یەکەم جــار دووگیان دەبن و بەرزیــان لە ١٤٥ســم کەمترە.

٣ — دوبــارە دووگیان بوون لە مــاوەی کەمتــر لە دوو ساڵ.

٤- زیاتر لە چوار دووگیانی.

٥- ئــەو دایکەی کــە منداڵی پێشوی بە زەحمەت بووە.

٦- ئــەو دایکەی کــە منداڵی پێشوی بە نەشتەرگەری بووە.

٧- ئەو دایکەی کە منداڵی پێشوی لە بار چووە یان مردووە.

٨- خۆین بەربوون لە زامالْ لە کاتی دوو گیانی.

٩- بەرز بوونی فشاری خۆین لە کاتی دووگیانی.

١٠- دووگیانی دووانە یان سێیانە یان زیاتر.

١١- نەخۆش بوونی دایک وەک کەم خۆینی ، ســێل، نەخۆشی دل و جگەر و گۆرچیلە، سوکەری.

١٢- بەد خۆراکی.
١٣- تای زۆر.
١٤- بێ ڕەنگ بوونی پێست.
١٥- پف بوونی دەم و چاو و دەست و قاچ.
هەر دایکێـک کە ئەم نیشـانانەی هەبێت بە زووترین کات دەبێ سەردانی بنکەی تەندروستی یان نەخۆشخانە بکات.

## ئامۆژگاری تەندروستی
## هێورکردنەوەی هەڵنج و ڕشانەوە لە ئافرەتانی دووگیان

ئـەو ئافرەتانەی کە لە سـەرەتای دووگیانی، هەڵنج و ڕشانەوەیەکی زوریان هەیە دەتوانن ڕەچاوی ئەو خاڵانەی خوارەوە بکەن.
١-کەم خۆری بەردەوام خۆر بن، بەم شێوەیە کە هەر دوو تا سێ کاتژمێر جارێک ژەمە خواردنێکی بچووک بخۆن، بەڵام کەم چەوری بێت.
٢- لە کاتی خواردن بە هێواشی بخۆن.
٣- زیاتر خواردنەکانی شـل وەک سوپ و خواردنەوە لە نیوان ژەمەکان بخۆنەوە تا کۆ لە گەل ژەمەکان، پێشگیری بکرێت لە ووشکایی لەش (Dehydration).
٤- کاتی هەڵنج هاتن، بە هێواشی قووم لە خواردنەوەیەک بدەن کە کاربۆنی تێدایە.
٥- خۆتان بپارێزن لە خواردنی ترشەمەنی و بەرهەمەکانی تەماتـە، نەعناع وە بیبەر. لـە وانەیە بۆ هەندێک کەس بیبەر ببیتە هۆی هێور بوونی هەڵنج.
٦- خۆتان لە خواردنی خۆراکی بە بەهارات و زۆر چەوری دار بپارێـزن یان کەم بە کار بێنن ، هەروەها خۆراکی پڕ رون و سورکراو بە کار مەهینن.
٧- یـەک یـا دوو کاتژمێر پێش نوسـتن خواردن و خواردنەوە مەخۆن.
٨- لە خواردنی خۆراکی بۆندار و لێنانی چێشـتی بۆندار کە هەڵنج هێنەرن خۆتان بپارێزن.
٩- قاوە و چای مەخۆنەوە.
١٠- لیمۆیەک کە تازە کەرت کرا بێت بۆن بکەن تاکو هەستێکی تازە پێتان ببەخشێت.
١١- تا دەتوانن هەوای تازە بمێژن و بحەسێنەوە.
١٢- کاتی هەسـتان لە ناو جێگا یان لە سەر قەنەفە بە ئارامی هەلبستن.
١٣- پەتاتە و نان زۆر بخۆن.
١٤- کاتی هەستانەوە لە خەو، پێش هەستان لە ناو جێگا تۆزێک سۆدە بخۆن.
١٥- پاش خـواردن کەمێک برۆن تاکو یارمەتی هەرس دانی خواردنەکان لە ناو گەدە بدەن.
١٦- جلی و بەرگی شل و فرە لە بەر بکەن.
١٧- کاتی نووستن، سەرتان تۆزێک بەرز بکەن.
١٨- هیچ کاتێک دەرمان بۆ هەڵنج و رشانەوە وەرنەگرن بێ ئەوەی لە گەڵ شارەزایەک (پزیشک یان پەرستار) قسە بکەن.
١٩- کۆلاندنی کەپسـولی زەنجەبیل یـان چای گیایی، سوود بەخشە بۆ هەندێک ئافرەتی دووگیان. نابی زیاتر لە یەک غرام لە رۆژێکدا بە کاربێنن.



# نەبوونی مافەکانی پەرستاران

پەرستار
فیض الله محمد رسول

کاتێ کە قوتابی بووم لە پەیمانگەو بەشی پەرستاری و لەهەموو وانەیەکی تیۆری و پراکتیکیەکاندا هەر ناوی پەرستارم بە بەرچاو نەکەوت ، ئەوکات هەستم بە بوونی پەرستاری خۆم نەکرد لەنێو پەیمانگەدا کەمن کەسێکم پەرستارم وەبروام وابوو دوای دەرچوونم ئەبمە کەسێکی کاریگەرو چالاک لەنێوەندی نەخۆشخانەکاندا بەو توانایەی کەهەمە بۆ خزمەت پێگەیاندنی نەخۆش .

دوای دەرچوونم لەپەیمانگەو ماندووبوونێکی زۆر تاکو دامەزرام ، لە نەخۆشخانەیەک بووم بە پەرستار ، بەڵام چ دامەزرانێک و چ پەرستارێک ئەو پەرستارەی کە لەقۆناغی قوتابیمدا مافم زیاتر پێ درابوو لەوەی کە لەنێو نەخۆشخانەدا هەمە ، جانازانم بە چ یاسایەک ئەم مافانەم لێ زەوت کراوە .

ئەشم ئەزانی کە ئاخۆ ئەبێ یاسایەک هەبێت بۆ سەندنی مافە پیشەییەکانی پەرستاران لەنێو نەخۆشخانەدا کە پێشکەش بە پزیشک کراوە . وە لەهەمان کاتدا زۆر کارو ئەرکی پزیشکی هەیە بەسەر مندا سەپێنراوە گرنگترین کار لە قوتابیدا بایەخم پێدەدا ئەویش وەرگرتنی نیشانە زیندەگیەکان(vital signs) کەئەرکی سەرەکی پەرستاران بوو بیکەن، کەچی لەنێو هەموو نەخۆشخانەیەک و شوێنی پێویست دا تەنها پزیشک لەلای بوو کاری پێ ئەکرد وەمنی پەرستاریش بۆم نەبوو ڕووی تێ بکەم ، جا ئەگەر جارێک ئاقیم بکردایەوە ئەوکات بەیاسای دەرچوون لەکاری پەرستار مامەڵەم لەگەڵ دەکرا وەنازانم چ جۆرە یاسایەک؟

ئێستا کە زانیم کە پەرستار بەسیستەمی دواکەوتووی ئێستا جگە لە دەرزی لێدان و ....... هەندێ پیشەی لاوەکی تر بۆی نیە کاری تر بکات . بۆشی نیە داوای مافە پیشەییەکانی خۆی بکات ، تاکو ئێستاکەش نەتوانراوە پەرستارێک بکرێت بە بەڕێوبەری گشتی پەرستاران یاخود کەسێک بەرپرسیت و تەلمیتراوی بەرگری کردن بێت لەمافی پەرستاران نەک بە ڕواڵەت بەرپرسیێت وە نەتوانێت هیچ بکات بۆ سەندن و گەڕانەوەی گشت مافەکانی پەرستاران . .

بوون و دامەزراندنی کۆمەڵەیەک وەک کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان هیوایەکی تازەی ئێمەی پەرستارانە بۆ داکۆکی کردن و ئەرک و مافەکانمان ، پێم وایە کۆمەڵەی پەرستارانیش ئەبێت هەوڵ بدات بۆ بەرگری کردن لەپەرستاران و خۆی بەکەسی یەکەمی پەرستاران بزانێت ، سەرباری ئەو ناوە پیرۆزەی هەڵی گرتووە ، بەبێ جیاوازی لەنێو کۆمەڵگای کوردی دا بۆ ئەوەی ڕۆڵی پەرستار دیارو بەرچاوبکات لەکوردستاندا .

# فریاکەوتنی سەرەتایی First aid

عەدنان عەبدولرەحمان



فریاکەوتنی سەرەتایی: بریتی‌یەلە لەپێشکەش کردنی یارمەتی پێویست و لەلایەن کەسێکی شارەزا بۆ کەسێکی تووش بوو بە ڕووداوێک.

یاخود بریتی یە لەو هەنگاوەی سەرەتایی کە ئەنجام دەدرێت لە سەرەتایی تووشبوونەوە تاوەکو گەیشتنی توشبوو بۆ شوێنی چارەسەر کردن لە پێناو پارێزگاری کردنی ژیانی توشبوو وە کەم کردنەوەی ڕێژەی زەرەرو زیانەکانی‌کە روو دەدەن بە هۆی هۆکارە جیا جیاکان ،بەم کارە فریاگوزاریانەی بۆ کەسی توش بوو بەرووداوێک ئەنجام دەدرێ دەوترێت (فریاکەوتنی سەرەتایی)

بێگومان چۆنیەتی دەست بەکاربوونی کارە فریاگوزاری یەکان بەستراوە بەجۆری ڕووداوەکە ، چونکەجیاوازی هەیە بە گوێرەی جۆری ڕوداوەکان یان کارەساتەکان.

## گرنگترین کارەساتەکانیش ئەمانەن:

- کارەساتە سروشتیەکان : وەک ( بومەلەرزەو ، گڕکان ، لافا، داڕمان ، رەشەبا، باران و ڕوچۆن ........ هتد )
- روداوی ئوتۆمبێل و شەمەندەفەرو فڕۆکەو بەلەم .
- ئاگر کەتنەوە.
- خنکان و لەژێرناوبوون .
- کەوتن لە شوێنێکی بەرز.
- مار پێوەدان .
- بەرکەوتنی گوللە .
- هەندێک نەخۆشی وەک (گەشکە) Epilepsy .

بێ گومان هەریەک لەم حالەتانەی سەرەوە کە ئاماژەی پێکراوە پێویستی بە فریاگوزاری جۆراو جۆر هەیە بەگوێرەی ڕووداوەکە .

کاری فریاگوزاری بۆ هەر ڕووداو و کارەساتێک جیاوازە لەگەڵ ئەوی تر . ئەوش بەگوێرەی جۆری کارەساتەکەو چەندیەتی و چۆنیەتی ڕووداوەکە وە هەندێ جار تووش بوو پێویستی بە یەک فریاگوزار یان زیاتر هەیە .

بێگومان زۆر جاریش وایە بەتایبەتی لەکاتی ڕودانی کارەساتە سروشتییەکان پێویست بەچەند تیم و ڕێکخراو فریاگوزاری و دەزگا حکومیەکانی حکومەت دەکات وەک( تیمی بەرگری میللی و تیمی ئاگر کوژێنەوە ... هتد )بۆ پێشکەشکردنی فریاکەوتنی سەرەتایی بۆ توشبووان.

جا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەچەند کارێکی ( فریا گوزاری سەرەتایی ) بکەم بۆ بەرکەوتوی گوللە (Bullet injury) برینداری شەڕ ئەگەر توشبووەکان زیاتر لە کەسێک بوون ئەوا پێویستە دەست بەجێ بەهاواری ئەوکەسە بچیت کەباری تەندروستی ناجێگیرترە وەمەترسی مردنی لێ دەکرێت .

تەنانەت لەبەرکەوتوی گوللەش لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تری لەش فریاگوزارە سەرەتاییەکان جیاوازن : وەک

_ بەرکەوتوی سەر Head injury

_ بەرکەوتوی سنگ Chest injury

_ بەرکەوتوی سک Abdomen injury

_ بەرکەوتوی خوێن بەرەکان injury Vascular

_ بەرکەوتوی بڕبڕەی پشت Spinal Cord injury

**بۆ هەریەکێک لەم حالەتانەی سەرەوە ئەم کارە فریاگوزاریانە ئەنجام دەدەین:**

١- لەسەرووی هەموویانەوە ئەنجام ڕەچاوکردنی A B C

واتا
A - Air way
B - Breathing
C - Circulation

١_ ئەنجام دانی کرداری A.B.C

A - Air way

١- پشکنینی دەم و ددانی دەستکرد ئەگەر هەبوو .
٢- پشـکنینی قورگ و بۆری هەناسـەدان و پاک کردنەوەی لەهـەر تەنێکی نامـۆ و دەردراوێک بۆ دوور خـستنەوەی لەخنکان.
٣- پێویـستە شتێک بخەینە ژێر ملی نەخۆش یان دەستێکت دەخەیە بن پشت ملی و دەستەکەی تر لەسەر نێوچەوانی سەری بۆ دواوە دەبێ .

B - Breathing

١- داکەندنی جل و بەرگ و بۆینباغ و ملوانکە و بازنە.
٢- بۆکردنەوەی بۆری هەناسـەی کەسێکی بێ ئاگا ( فاقد الوعی ) شتێکی دەخەینە نێوان ددانی بۆ ئەوەی دوورکەوینەوە لەگیرانی بۆری هەناسە و گەستنی زمانی .
٣- بۆ دلنیابـوون لەهەناسـەدانی(بەرکەوتوەکە) بەتەواوی بەگوێگرتن لەدەم و لووتی و سـەیرکرنی سـنگی تەماشای هەناسەدانی دەکەین واتا (بیستن و بینیین) لەیەک کاتدا.
٤- ئەگەر هەناسەدانی نەبوو ئەوا یەکسەر کرداری هەناسەدانی (دەم بۆ دەم ) دەسـت پێ دەکەین (Mouth to mouth) ئەگەر لەهەمان کاتیشـدا دلیشـی وەسـتابوو ئەوا کرداری هەناسەدان و شێلانی دلی بەیەکەوە بۆ دەکەین
بۆ گەوران هەناسە بەرامبەر شێلان
بۆ منداڵان هەناسە بەرامبەر شێلان
بۆ ئەم کردارەش پێویـستە ژێر پشتی رەق بێت باشتریش وایە تەختەیەکی رەق،دابنێین نابێ لەسـەر دۆشـەک و ئیسفەنج بێت .

C - Circulation

کونترۆڵکردنی خوێن بەربوونی شـوێنی پێکان بۆ ڕێگەگرتن لەبورانەوە بەئەنجام دانی :
أ - بەرزکردنەوەی بەشە تووش بووەکە.
ب - فشار خستنە سەر برینەکە.
ت - ئەگەر چارەسـەر نەکرا بەم دوو خاڵەی ئاماژەمان پێدا ئەوا پەنا دەبەینە بەر بەسـتانی ( تۆرنیکا ) واتا ( بەستانی سـەرەوەی شـوێنە بریندار بوەکە بە پارچە قوماشـێک ) باشـتروایە لە پەتێك یان وایەر بەڵام بە مەرجێک دەبێ هەر (٥-١٥) خولەک جارێک بکرێتەوە .

**لەکاتی لەبەر ڕۆیشتنی‌خوێن لەهەربەشێکی لەش ئەوا باری تەندروستی کەسەکە بەرەو سەدمە (Shock)دەچێت :**

ئەم نیشانانە ڕوودەدەن :
١- زەرد هەڵگەرانی دەم و چاو Pale
٢- سارد بوونی دەست و پێیەکانی cold extremity
٣- ئارەقەکردن sweating
٤- دابەزینی تەوژمی خوێن hypotension
٥- خێرا لێدانی دڵ Tachycardia
٦- خێرا هەناسەدان tachypnea

**بێ هۆش بوونیش لەحالەتە بەهێزەکان**
**(فقدان الوعی فی حالات الشدیدە)**

١- لەم بارەدا پەلەکانی نەخۆش (قاچەکانی) بۆ سەرەوە بەرز دەکەینەوە .
٢- هەروەها دەربارەی چۆنیەتی دانانی کەسی تووش بوو
أ- بەرکەوتوی سـەر(head Injury) پێویـستە لەسـەرلا دانرێ.
ب- بەرکەوتوی سـینگ (chest injury) پێویـستە بەنیوە دانیشتن بێت
٣- تیمارکردنی و داپۆشینی برینەکان:
أ- لەبەر کەوتوی سکدا ئەگەر ریخۆلەکان لەدەرەوە بوون نابێ پەنا ببرێتە بەرخستنە ناوەوەی لەبەر ئەوەی زیانی زیاترە بەلکو دەبێ داپۆشرێت بەپارچە گۆزێکی خاوێنی تەڕکراو بە نۆرمەل سەلاین ( normal saline) یان رینگەر(Ringer).
ب- لەبەر کەوتوی سینگ دا ئەگەر شوێنی چوونە ژوورەوەی گوللە یـان پارچە هەبوو پێویـستە بەزوترین کات دابخرێ بەسفراتۆل یان بە گۆزێکی بە ڤازلین بۆ ئەوەی هەوا نە چێتە ناوی .
ج- دانانی ڕاگر ئەگەر شـکانی هەبوو لە پەلەکانی بۆ کەم کردنەوەی جولەی بەشە شکاوەکە .
پاش کۆنترۆل کردنی نیشانە زیندە گەکانی نەخۆشەکە . دەیگوازینەوە بۆ نزیکترین نەخۆشخانەی گشتی .

# پەرستاران ، ئەرک و بەرپرسیارێتی

نێرگز حسن عبداللە
قۆناغی یەکەم
کۆلێژی پەرستاری

ئەو رۆژگارەی کە مرۆڤ پێی خستۆتە سەر گۆی زەوی و ئاوەدانی کردۆتەوە لە جەستەی خۆی وردبۆتەوە و بیری لە چارەسەری نەخۆشیەکانی کردۆتەوە و زۆر بەتەنگ چارەسەری ئێش و ژانی جەستەیەوە چووە هەوڵی داوە دەرمان بدۆزێتەوە و ئێش و ژانی نەخۆشییەکانی خۆی کەم بکاتەوە و دەتوانین بڵێین زانستی پزیشکی بەو سادەو ساکاریە لێرەوە دەستی پێکردووەو وەکو هەر زانستێکی تر زیادو بەرەو پێش چووە یەکێ لە لقەکانی یاخود گروپێ لەو گروپانەی زانستی پزیشکی پێش خستووە دەستی بە سۆزی پەرستارانە.

شتێکی حاشا هەڵنەگرە پزیشک و داودەرمان بەبێ بوونی ئەودەستە بەسۆزە کەم و کاسو ناکامڵە رەنگە ئەگەر ئەو دەستە بەسۆزە نەبێ نەخۆش دڵشکاوتر دەبێت یا نەخۆشیەکەی دەستی لێ دەستێنێ و بەرەو مەرگ دەچێت بە شاهێدی هەموو ئەو کەسانەی کە نەخۆش بوون پەرستار خەم و ئازارەکانی نەخۆش کەم دەکاتەوەو ناهێڵێ لەسەر هەموو لایەکمان پێویستە رێز لە پەرسیاران بگیرێت و لێ نەگەرێن ئەو دەستە ئائومێدی بەخۆیەوە ببینێ.

لێرەدا پێم باشە چەند ئامۆژگارییەک بخەمەروو بۆ خۆم و پەرستارانی ماندوونەناس :

١- پەرستار پێویستە شارەزایی و کارامەیی لە ئیشەکەیدا هەبێ بەرێگای کۆن و نوێ، لە حاڵەتێکدا ئەیتوانی بە رێگەی نوێ خزمەتی نەخۆش بکات رێگای کۆن بگرێتە بەر، بەمانایەک پێویستە شارەزای هەموو داب و نەریتێکی کۆمەڵگا بێت شتێک نەکات لە داب و نەریتێکی نەخۆش بەدەربێت لە کاتی خزمەتکردنیدا ئەگینا رەنگە دڵی نەخۆشەکە برەنجێت و لە جیاتی ئەوەی لە ئێش و ئازاری کەم بکاتەوە باری دەروونیشی تێک بدات.

٢- هەموومان دەزانین کە بەنەخۆش دەگوترێت نەخۆش چونکە لەهەموو روویەکەوە نەخۆشە جەستەکەی ئازاری هەیەو باری دەروونی تێکچووە جا دەبێت پەرستار وەک چۆن ناسراوە بە سۆزەوە مامەڵە لەگەڵ نەخۆش بکات و یارمەتی بدات.

٣- یەکێک لەهەرە خەسلەتە پاکەکانی پەرستارَ کە لە خەڵکی تریش جیای دەکاتەوە ئەوەیە زمان شیرینی و رەفتار جوانیە، پەرستار ئەوەندەی بۆی دەکرێت لەگەڵ نەخۆش گوفتاری خۆش و زمانی شیرین بێت.

٤- ئەگەر کەسانی تریش نەخۆشیان تورە کردبوو هەتا ئەگەر نەخۆش بەزمانێکی توورەشەوە قسەی کرد پەرستار نابێت نەخۆش توورە بکات و دەبێت هێوری بکاتەوە چونکە وەک پەندی کوردی دەڵێت (خەڵک کە شێت بێت دەچێتە سەر ئومەرمەندان ئەگەر ئومەرمەندان شێت بوو روویکاتە کوێ؟)

٥- زۆرجار نەخۆش هەستی پەرستار و کارمەندانی تەندروستی بریندار دەکات، پەرستار نابێت ئەو قسانەی نەخۆش بەهەند هەڵبگرێت و واز لە خزمەتکردنی نەخۆش بێنێت.

٦- پەرستار وەک چۆن پارێزگاری لە کەل و پەلی ماڵەوە دەکات ئاوەهاش دەبێت پارێزگاری لە کەل و پەلی نەخۆشخانە و بنکە تەندروستیەکان بکات چونکە کەل و پەلی نەخۆشخانە مولکی دەوڵەت و میللەتە وەبە فیرۆدانی ئەو کەل و پەلانە بە فیرۆدانی سامانی نیشتمانیە.

٧- پەرستار دەبێت ئەو پەڕی لێبوردەیشی هەبێت بەرامبەر کارمەندانی تەندروستی و هاوکارانی، ئەگەر دڵی لەیەکێکی شکا لەخۆڕا قسەی پێ هەڵنەبەستەو ناوبەدی نەکات.

٨- پەرستار نابێت بەهیچ شێوەیەک خۆی بەسەر کەسانی تردا هەڵکیشێ و هەر لەبەر ئەوەی لە حزب و لایەنی ئەو نیە دەمەدەمێ لەگەڵ نەکات و خۆی لێ نەگرێت.

٩- پەرستار پێویستە وەکو سەربازێکی ئەناسراو کاربکات و هەرگیز ئەوەی بەدڵدا نەیەت بۆ فلان ئەو کارە ناکات، واباشە منیش خۆم لەو کارە بدزمەوە، بە مانایەکی تر لەکارکردن خۆی لە هیچ کەسێک نەبەستێتەوەو وە ئەو کارەی دەتوانێت ئەنجامی بدات بە لێبراوی ئەنجامی بداو بەتەمای کەسانی تر لێنەگەرێت.

١٠- ئەو کارەی ئەنجامی دەدات پێویستە بە ئەرکی خۆی بزانێت و چاوەڕێی مژدە و پاداشت دانەوە لەسەری نەبێت.

## ڕێ پیشاندانی تەندروستی بۆ خۆپاراستن لە دژی نەخۆشی

# ئەنفلەوەنزای باڵندە H5N1

د.جەمال عادل
پسپۆری هەناو و گەدە



١- دورکەوتنەوە لە کرین و فرۆشتنی باڵندە ی زیندوو لە بەرئەوەی نەوەک ئەو باڵندەیە هەڵگری ئەو نەخۆشە بووبێت.

٢- دەست شوشتن بە ڕێک وپێکی چونکە ئەو ڕێژەی گواستنەوەی نەخۆشی کەم دەکاتەوە بۆ بۆ مرۆڤ .

٣- دەست شووشتن پێش نان خواردن یان دوای دەست دان لە باڵنەی زیندوو وە گۆشتی مریشکی خاو .

٤- هەمان ئەوچەقۆیە بەکارمەهێنە یان ئەو پارچە تەختەی گۆشتی لەسەر ووردەکەی بۆ خواردن وسەوزە وە پێویستە پێش و پاش بەکارهێنان بەباشی بشورێت.

٥- پێوستە گۆشت بە باشی بکوڵی بەمەش پێویستە پلەی گەرمی بگاتە سەرووی ٧٠٪ بۆ گۆشتی مرشک و هێلکە چونکە لەسەرووی ٧٠پلەی سەدی ڤایرۆشەکە دەمرێ.

٦- پێویستە ئەودەست کێشەی کەبەکارێ بۆ ئیشی ڕۆژانەی چێشتخانە پێش و پاش بەکارهێنان بە باشی بشورێ.

٧- ئەبێ ئەوقاپ و پێویستیانەی بە کاریدێنی بۆ ئامادەکردنی خواردن بە ئاوو سابون بشورێت.

٨- دوورکەوتنەوە لە شوێنی گومانلێکراو وە خۆپاراستن لە دەست دان لە باڵندە.

٩- لەکاتی هەست کردنت بە نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە لە خۆت یان لەو شوێنی نیشتەجێبوونت پێوستە دەست بە جێ ئاگاداری نزیکترین بنکەی تەندروستی بکەیتەوە بۆ ڕێگە گرتن لە تەشەنەکردنی ئەم نەخۆشیەو کۆنترۆلکردنی.

# ڕەوشی پەرستاری لە سۆران

پەرستاری پیشەیەکی مرۆڤایەتی خۆبەخشی بەخشندەییە ، بۆیە بە (فریشتەی میهرەبانی ) ناودەبرێ، چونکە ڕەفتار لەگەڵ هەست ونەستی مرۆڤی نەخۆش دەکات بەخۆشەویستیەکی بێسنور و باوەربونیکی ڕاستگۆیانە نەخۆش دەدوینی و ئامانجی تەنیا هاریکاری وچارەسەری خودی مرۆڤەکەیە لەو کێشەو گیرو گرفتانەی کە تیایاکەوتوە لەرووی تەندروستی ودەروونیەوە . لەشارێکی وەکو سۆران کەژمارەیەکی زۆری دانیشتوان بەخۆوە دەگرێت بەچەندین چین و توێژی جیاجیا ، لەگەڵ نەبوونی خزمەتگوزاریەکی بەرچاو چ لەروی ئاوەدانیەوە چ لەلایەنی تەندروستی و ژینگەپاریزیەوە ئاخۆ پەرستاران چۆن پیشوازی لە خەلکی نەخۆش دەکەن کە ڕۆژانە ڕێژەیەکی زۆری خەلک توشی نەخۆشی دەبن و سەردانی نەخۆشخانە دەکەن وەلەهەمان کاتدا خودی نەخۆش تاچەند هاریکارە لەگەل پەرستیار بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی بۆ ئەم کۆمەڵە راوسەرنجە چەند پەرستاریک لە نەخۆشخانەی سۆران بۆمان هاتنە دووان .

ڕیپۆرتاژ :
دلگەش عەبدوللا هاودیانی



سـەرەتـا شێخ وەسـتـا محمد شێخ سەرۆکی پـەرستـارانـی کوڕ سەبارەت بە رەوشی پەرستاران لەدەڤەری سۆران وتی : ڕەوشی پەرستاران لەسۆران بەرەو پیش چونی هەیە بەلگەشمان بۆ ئەمە کاتێک خولێکی خیرای پەرستاری کراوە خەلکێکی زۆر رووی لەم بانگەوازەیە کرد .

هەرودها سەبارەت بە کەسایەتی پەرستار لەناو کۆمەڵگادا وتی بەداخەوە تا ئیستاش لە کۆمەڵگای ئێمە بەچاوێکی تر سـەیری پەرسـتار دەکرێت بەهایەک بـۆ ئەم کارە پیرۆزەی دانانین خەلکانێک خۆیان بە رۆشـنبیردادنین کەچی بەهەمان چاو سەیری پەرستار دەکەن کە خەلکە نارۆشـنبیرەکە ئەیبینێو هەڵی دەسەنگێنێ، هەروەها من زۆر گەشبینم بەئایندە چونکە ژیان هەروا نابیت کەجۆرە کەسانیک بەوجۆرە تێی دەروانن بەتایبەت بۆ پەرستارانی کچ ژیـان لەگۆرانە بەڵام نەبێت خۆمـان هەوڵبدەین و ساردنەبینەوە لە ئەرکەکانمان پەرە بەکارەکانمان بدەین.

هەرووەها سەبارەت بە گرتنەبەری رێوشوێن بۆ بەرەوپێشبردنی پیشـەی پەرسـتاری وتـی داواکارم لەحکومەتی هەریم کەزۆر گرنگی بە پەرسـتاران بدات لە رێی سـازکردنی خولی زانسـتی بەردەوام بە پێی ئاستی زانستی پەرەستاران وەهەروەها لـەرووی مووچە چونکە موچەیان زۆر کەمە بەشـی دابینکردنی تەنانەت ژیانێکی زۆر سادەش ناکات وە ئەگەر بـەراوردی بکەین لە گەل کاتژمێری کارکردن بەداخەوە ئـەم برە مووچەیە هیچ بەرامبـەر نیە وە زۆر ناهاوسەگە ئەمەش سـەرەکیترین هۆکارە بۆ دواکەوتنی خزمەتگوزاری تەندروستی لە ناو نەخۆشخانەکان چونکە بەشێکی زۆر لە پەرستاران بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان بەناچاری بەنا بۆ کاری تردەبەن لە دەرەوەی نەخۆشخانە کە بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ پیشەکەیان ناگونجێت.

دواتر( منیرە یوسف محمد) پەرستاری نیشتەجێ (دەرچووی زانکۆ ) سـەبارت بە رەوشی پەرسـتاری لە سۆران وتی دەڤەریکی وەکو سـۆران رەوشی پەرستاران بە شیوەیەکی گشـتی بەباش نابینم چونکە پەرسـتاران ماندوبونیکی زۆریان پیوە دیارە بەبێ هـاوکاری کردنـی خەڵـک لـەهەمـوو رووێنکـەوە بەتایبەت لەرووی ریز گرتنیان.



هەرودهـا سـەبارەت بەکەسایەتی پـەرستار

وتی پیشەی پەرستاری بۆخۆی کاریکی پیرۆزە چونکە پەرستار وەک هەربەشێکیهەرەگرنگی هەیکەلی تەندروستی هەر ولاتێک خزمەتیکی گەورە بەخەلک دەکات بەلام بەداخەوە هەلسەنگاندنی پەرستار لەلایەن کۆمەلگای ئێمەوە بەشیوەیەکی زۆر ناهاوسەنگ .

دواتر سەبارەت بە ئایندەی پەرستاری لەو دەڤەرە کە وتی راستە لە سۆران ئامادەکاری دەکرێ بۆ پیشڤەچونی ئاستی خزمەتگوزاری تەندروستی بەتایبەت ئاستی پەرستاران بەلام بەداخەوە نەگیشتۆتە ئەو راددەیەی کە ئێمە پێیەوە گەشبین ببین ،بۆیە ئەمەش کاتێکی زۆری دەوێ بەلام دەبێ ئیمە هەمومان پیکەوە واتا ستافی نەخۆشخانە لەگەڵ هاوکاری جەماوەر کاربکەین تاکو بگەینە ئەنجامیکی باش هەروەها وتی داواکاریم ئەوەیە کە زیاتر پەرە بەپیشەی پەرستاری بدریت ریزیکی تایبەتی هەبیت .داواکاریشم کە خولی خیرای پەرستاری بن بڕ بکریت واتە خولی شەش مانگە چونکە هۆکارە لەکەم کردنەوەی بەهای پەرستاری بۆیە بەلایەنی کەمەوە ئەم خولانە ناوی پەرستاری لێنەنرێت من بەکاریکی باشی نازانم .

هەروەها فازل ئەسعەد پەرستاری پەیمانگە لە نەخوشخانەی سۆران سەبارەت بە رەوشی پەرستاران لەدەڤەری سۆران وتی: لەبەر ئەوەی سۆران دەڤەریکی فراوان و لە فراوان بوونە و خزمەتگوزاریەکی ئەوتۆی نیە



خەلکەکەشی تارادەیەک ئاستی هۆشیاریان کەمە بۆیە ئەمە ئەرکی پەرستاران قورستر دەکات هەرچەند پەرستاران کەمتەرخەم نین زۆر بەپیر داخوازیەکانی نەخۆشن ، زۆر هیلاک دەبن بەلام بەهۆی هاوکاری نەکردن و دەستەبەرنەکردنی داخوازیەکانی خودی پەرستار من رەوشەکە بەباش نابینم.

هەروەها سەبارەت بە کەسایەتی پەرستار لەناو کۆمەلگادا وتی : پەرستارەکان وەک کادری پزیشکی پیشەیان بەدەنگەوە هاتنی خەلکە لەکاتی توشبونیان بەنەخۆشی بەلام بەداخەوە زۆربەی خەلکی ئەم دەڤەرە ریزوقەدریان بەرامبەر بەپەرستار بەگوێرەی پێویست نیە. سەبارەت بە ئایندەی پەرستاریش وتی : لەم دوایەدا بەریوەبەرایەتی تەندروستی سۆران هەلسا بەکردنەوەی خولیکی شەش مانگە بۆ ژمارەیەکی زۆری کچانی دەڤەری سۆران بەمەبەستی زیادکردنی ریژەی پەرستاران لەسۆران بەشیوەیەکی زانستی و پیشکەوتوو من گەشبینم بەوەی کەدەتوانن خزمەتیکی بەرچاو بەدەڤەرەکەبکەن لەروی تەندروستیەوە ، هیوادارم هەریەردەوام بن لەسەر کردنەوەی ئەم جۆرە خولانە، وە زیاتر باش کردنی رەوشی گوزەرانی پەرستاران لەهەمو رویەکەوە

سەبارەت بە داوکاریەکانیش وتی داواکارم لەحکومەتی هەرێم کە زیاتر پەرە بە بەهرەی کادری ناوەند بدات ئەمەش بەکردنەوەی خولی بەهیزبون و راهینان لەسەر ئامێرە نوێیەکان و سود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای سەردەم ناردنی کادری ناوند بۆ دەرەوەی وولات بۆ خولەکانی کەلەوی دەکرین و بەرزکرنەوەی ئاستی بژیوی پەرستاران لەهەموو روێکەوە.

هەروەها گەلڤین عەلی جاسم سەرۆکی پەرستارنی کچ سەبارەت بە رەوشی پەرستاران لەدەڤەری سۆران وتی: رەوشی پەرستاران بەشیوەیەکی گشتی باش



دەبینم چونکە هەردەم بەریوەبەرایەتی تەندروستی سۆران و بەریوەبەرایەتی نەخۆشخانەی سۆران بە پیر داخوازی پەرستاران بوونە بۆ ئەمەش چەندین خول کراوەتەوە بۆ پیگەیاندنی پەرستارانن و بەرەودان بە ئاستی زانستی پەرستاران هیوادرم زیاتریش بکرین ئەم هەولانە .

هەروەها سەبارت کەسایەتی پەرستار وتی بەگویرەی

کاری پەرستاری کەهەردەم بەتەنگ داخوازی نەخۆشەوەن لەناو کۆمەڵگاش کەسایەتی پەرستار کەسایەتیەکی تایبەتمەنـدی هەیە بەڵام بەداخەوە لەگۆمەڵگای ئێمە بە چاوێکی تر سەیری پەرستار دەکرێ .

دواتر سەبارەت بە ئایندەی پەرستاری وتی من زۆر گەشبینم بەئایندەی پەرستاری چونکە ئەو بیرکردنەوەی جاران نەماوە لەناوکۆمەڵگا سەبارەت بە پەرستاران بەتایبەت کچان بەڵگەش بۆ ئەمە روتێکردنی بە لێشاو بۆ خولی خێرای پەرستاری کە بەم دواییە کراوە لە نەخۆشخانەکەمان ، هەروەها وتی داواکارم حکومەت و وەزارەتی تەندروستی زیاتر پەرە بەلایەنی زانستی پەرستاران بدەن ئەمەش بەکردنەوەی جۆرەها خول لەناوەوەو دەرەوەی وڵات ، زیادکرنی موچەو دەرماڵە تایبەتیەکان . هیوادارم کە کۆمەڵەی پەرستاران زیاتر ئەکتیڤ بی چونکە ئەمە هیوای هەموو پەرستارێکە دەبی حکومەت هاوکاری ماددی و مەعنەوی بکات.

دواتر نزمی فەرخۆ پەرستاری پەیمانگا سەبارەت بە رەوشی



پەرستاران وتی: رەوشی پەرستاران لە سۆران بەخراپ دەبینم لەچەند روێکەوە هۆکاری زۆر هەن بۆ خراپ بوونی رەوشەکە لەوانە نیداری ، خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەسۆران بۆتە هۆی ماندوویونی پەرستاران بەتایبەت لەناو نەخۆشخانەی سۆرانی گشتی لەبەرئەوەی کارمەند کەمن ئەوەش لەنەبوونی پەرستاران نیە بەلکو بەهۆی دۆستایەتی و خزمایەتی بەنامەی بەرپرسێک دەگوازرێنەوە بۆ بنکە تەندروستییەکان کە پێویستیشیان پێ نیە بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە خولی خێرای پەرستاری دەکەنەوە کەچی پەیمانگای تەکنیکی سۆران بەشی نەخۆشەوانی هەیە کە تائێستاش چەندین دەرچووانی هەن دانەمەزراون بۆ ئەوان دانامەزرێنن ئایا ئەوە نابێتە هۆی دواکەوتنی هۆی پەرستاران لەرووی زانستیەوە هۆی سەرەکی دروست بوونی ئەم رەوشەوە خراپە لاوازی پەرستارانە بەهۆی یەکنەگرتنیان و نەبوونی سەندیکایەک کە ببێتە مینبەرێک بۆ بەرزکردنەوەی داواکاریەکانیان و گەیاندنیان بەدەسەڵات .

هەوەها سەبارەت بە کەسایەتی پەرستار لەناو کۆمەلگادا وتی هەرچەند سۆران دەڤەرێکی بەرفراوانە بەڵام بەداخەوە خەڵکەکەی لەروی رۆشنبیریەوە دواکەوتوون بەتایبەت لایەنی تەندروستی بۆیە لەپیرۆزیەکانی پەرستاری تێ ناگەن هەرچەند پەرستاران دڵیان فراوانە ئەوەندە بایەخ بە هەڵسوکەوتوو قسەی جۆرە خەلکانێک نادەن بەڵام زۆر جاریش نەخۆش باجەکەی دەدات. هەروەها وتی بەراشکاوانە دەڵێم گەشبین نیم بە ئایندەی پەرستاری لە سۆران چونکە لە هیچ لایەنێکی پەیوەندیدار هەنگاوێک نابینم کە دڵخۆشم بکات

سەبارت بە داواکاریش بۆ پێشخستنی پشەی پەرستاری وتی بۆ بەرەو پێشچوونی رەوشی پەرستاران لەسۆران دەبێت چەند کارێک بکرێت هەرچەندە درەنگە بەڵام درەنگ هاتن لەنەهاتن باشترە کاری یەکەم لایەنی ماددیە دەبوایە لەسۆران گەرەکی فەرمانبەران بکرێت لەناو ئەو گەرەکە کۆڵانی پەرستاران هەبێت یان شوقەکانی فەرمانبەران و شوقەی پەرستاران تا ئێستا تەنها چەند کەسانێک سوودمەند بوون بە وەرگرتنی خانوو زەوی هەروەها مووچەو دەرماڵەو مەترسی نەخۆش بوون و ماندووبوون کێشەی هەموو پەرستارانە ، لایەنی دووەم زانستیە من لێرەدا بەپرسیارێک وەڵام دەدەمەوە ئاراستەی رێکخراوە تەندروستیەکان و وەزیری تەندروستی و فەرمانگەی تەندروستی هەولێرو بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی سۆران و قایمەقامی سۆران دەکەم بۆچی لەهەموو فەرماگەیەک و لەهەموو توێژێک کارمەند رەوانەی دەرەوە کراوە بۆ خولی زانستی و مەشق کردن تەنانەت مەلای ئاینیش رەوانە کراون تەنها پەرستاران نەبن ، لایەنی سێیەم مەعنەویە کە ئەودوو لایەنی پێشوو باسکران بێگومان کاریگەریان لەسەر دەبێت ، پەرستارانیش بە بڕوا بەخۆبوون دەتوانن بەرەو پێش بچن و دەزگاکانی ڕاگەیادنیش دەتوانن ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبێت لە هۆشیارکردنەوەی خەڵک و پەرستاران .

# نەخۆشیە گواستراوەکان و پەرستاران

هەرێم عومەرکاکل

هەروەک ئەزانرێت کە کەسی
یەکەم کەمامەڵەی ڕاستەوخۆی بەردەوام
لەگەڵ نەخۆش دا هەبێت ( پەرستار) ە بۆخزمەت
گەیاندن بەخودی نەخۆش . چونکە پێم وایە تاکو باری نەخۆش
چاکتر ئەبێت پەرستار ڕۆڵی خۆی ئەبینێ لەخزمەت پێ گەیاندنی و
چارەسەر کردنی .
بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کەلە دەرەنجامی مامەڵەکردنی پەرستار لەگەڵ
نەخۆش لەوانەیە پەرستاران توشی هەڕەشەی کۆمەڵێک نەخۆشی گواستراوە ببنەوە کە
نەخۆشەکە هەیەتی و گرنگترین نەخۆشیش نەخۆشی( هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر)ە کەئەویش
گواستنەوەی ئەم نەخۆشیە لەڕێگەی خوێنی کەسی تووش بوو دێت بۆ کەسی ساغ ، ئەم نەخۆشیە
بەربڵاوترین نەخۆشیە لەنێو کۆمەڵگای کوردی داو بەتایبەتی لە نێو نەخۆشخانەکاندا کە هەست
بەبوونی ئەکرێت لە ئەنجامی پشکنینی تاقیگەیی ئەزانرێت .
بەهۆی خودی مامەڵەکردنی پەرستاران لەگەڵ نەخۆشدا زۆرجار مەترسی گواستنەوەی لێ ئەکرێت بۆ
پەرستاران بەتایبەتی لە شوێنەکانی کە مامەڵە بە خوێنی نەخۆش ئەکرێت (چارەسەرکردن لەڕێگەی
خوێن) ئەوانیش بەشەکانی
(نەخۆشیەکانی خوێن و گورچیلەی دەستکرد و نەخۆشیەکانی هەناو و چاودێری برین و نەخۆشخانەی
فریاکەوتن)ن.
وەتاکو ئێستاکەش چارەسەری گونجاو دانەنراوە یاخود پلانێک لەلایەن وەزارەت بۆ ئەم مەسەڵەیە
لەروی بەئاگابوون و هۆشداری دان بە پەرستاران و پشکنینی پەرستاران چەند مانگ جارێک
لەتووش بوون بەم نەخۆشیە لەم شوێنەی کە ئەم نەخۆشیەی تێدا بڵاوە ، دەرکردنی ڕێنمایی
پێویست بۆخۆ پاراستن لەم نەخۆشیە . وە دابین کردنی پێ کوتە (لقاح ) ی ڤایسین دژی
ئەم نەخۆشیە
پێم وایە پەلەکردن لەم مەسەلە بۆ سێ هۆ ئەگەرێتەوە
١- بۆ پاراستنی ژیانی پەرستاران لەم نەخۆشیە .
٢- بۆ پاراستنی کەسانی مامەڵەکار(کەسانی نزیکی نەخۆش) .
٣- بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی ئەم نەخۆشیەو ڕێگەگرتن لە
نێوکۆمەڵگای کوردی دا.

# ئامادەیی نەخۆشیارانی کچان دوای شازدە ساڵ هەر لەسەر پرۆگرامی کۆن و بە زمانی عەرەبی دەخوێنن

**سەرەتای خوێندنی پیشەیی پەرستاری بە شێوەیەکی ئەکادیمی دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەییە پەرستاریەکان بە تایبەتی لە هەرێمی کوردســتان یەکێکیش لەو بنکە ئەکادیمیانەی پیشــەی پەرستاری تاوەکو ئێستا چەندەها پەرستاری کارامەی تیایدا پێگەیشتوە و خزمەتی هاولاتی دەکەن لە نەخۆشخانەکاندا ئامادەیی نەخۆشــیارانی کچانە. لە بەسەر کردنەوەیەکدا بۆ ئەو ئامادەییە مامۆستایان و قوتابیان سەبارەت بە پیشەکەیان و ئامادەیی یەکەیان بەم شێوەیەی خوارەوە هاتنە وەلام :**

**ڕیپۆرتاژ - سلێمان عبدالهادی**

**ســەرەتا مامۆستا دیمەن حسین نبی بەڕێوەبەری ئامادەیی نەخۆشیاری کچان بەم شێوەیە هاتە ئاخاوتن** : دامەزراندنی ئامادەیی نەخۆشــیاری کچان دەگەڕێتەوە بۆ ســاڵانی( ١٩٨٠-١٩٨١ )خوێندن لە ئامادەیی یەکەمان زۆر جیاوازە لەگــەل ئامادەیــی یەکانی تر لــە ڕووی خوێندنــەوە ، چونکە لــە ئامادەییەکەمان خوێنــدن بــە تیۆری (نظری) و پراکتیکی (عملی) دەخوێنرێت کە شێوازی خوێندنەکەش ٣ ڕۆژ وانــەی تیۆری دەخوێندرێــت. ژمارەی قوتابیان ساڵانە بە هەر سێ پۆل نزیکەی ١٠٠ قوتابی دەبێت و ژمارەی مامۆســتایانیش ٤٠ مامۆستا بۆ هەموو ساڵێکیش ئێمە دوو قوتابیمــان لە(زانکۆی هەولێری پزیشــکی- کۆلێژی پەرســتاری) وەردەگیرێــت لەگەڵ پێنــج قوتابی تر لە پەیمانگەی (تەکنیکی - بەشی پەرستاری) بە پێی ئاستی نمرەکانیان کە مەڵبەندی ناوەندی وەرگرتنی قوتابیان بڕیاری لەسەر دەدات.

ئــەو قوتابیانەی کەلــە ئامادەییەکەمان دەردەچن وەکو (پەرســتاری کارامە)لەو ئاســتەدان کــە بتوانن لەنێو نەخۆشــخانەکاندا کار بکەن و هەوڵیش دەدەین بۆئەوەی دابمەزرێن دوای دەرچوونیان.

ئەم ساڵیش لە فەرمانگەی تەندروستی هەوڵ دراوە بۆ ئەوەی دامەزراندنی پەرســتاران ئەوانەی کەلــە ئامادەییەکەمان دەردەچــن ڕاســتەوخۆ دابمــەزرێــن لــەدوای دەرچوونیشــیان، ئەم بڕیارەش بەرز کراوەتەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران و بڕیاریشــی لەســەر دراوە ، وە ئەوانــەی کە دانەمــەزراون لە ســاڵی ڕابردوو ئەتوانن ناویان بنوسن بۆ ئەوەی دابمەزرێن و لەم ساڵەوە کاری پــێ دەکرێــت ئێمەش نــاوی ئەوانەی



کە دەرچوونە بەرزمان کردۆتەوە بۆلایەنی پەیوەندار، هەر ئەم هۆکاری دانەمەزراندنەشە بووەتە هۆی ئەو بۆشاییەی کە نەبوونی پەرستاری کارامەی کچ لە نێو نەخۆشخانەکاندا هەبێت بەڵام بە هۆی بڕیاری ڕاستەوخۆ دامەزراندن پێم وایە گرفتەکە کەم دەبێتەوە بەرەو چارەســەری دەڕوات.

**مامۆستا ئەمیرە عەزیز عەلی یاریدەدەری بەڕێوەبەر وتی :**
من ٣١ ساڵە مامۆستام و پێکهاتەی ئامادەیی نەخۆشیاری کچان پێک هاتووە لە (کارگێری - ژووری مامۆســتایان

- ژووری یارـــدەدەر. خۆیەتـــی - تاقیگـــەی پەرســـتاری- تاقیگەی زانســـت - تونـــکاری - پەرتوکخانە - پۆلەکان ) پرۆگرامی خوێندنی ئامادەییەکەمان پێک دێت لە وانەی تیۆری و وانـــەی پراکتیکی ، وانە پراکتیکیەکان کە لە نەخۆشـــخانەکان ئەنجامی دەدەن بەڵام بەداخەوە قوتابیان روبەرووی گەلێک کێشەدەبنەوە چونکە لە نەخۆشخانەکاندا ئـــەو ئیمکانیەتە نیە کە قوتابی فێـــر ببێت وەک ئەوەی لـــە ئامادەیی نەخۆشـــیاری خوێندویەتـــی و یاخود بواری کارکردنی نادرێتێ بۆ ئەوەی وانە پراکتیکیەکەی ئەنجام بدات ، پێشـــم وایە هەر ئەم هۆکارە دوولایەنەشـــە بووتە هۆی دابەزینی ئاستی تەندروستی لە نێو نەخۆشخانەکاندا چونکە ئەوەی دەخوێنرێت زۆر جیـــاوازە لەگەڵ ئەوەی لە نەخۆشخانە ئەنجامی دەدات .

هەروەها گرفتی پەرتوکەکانی خوێندن لە ئامادەییەکەمان کە تا ئێستا بە زمانی عەرەبیە نەگۆردراوە بۆ سەر زمانی کوردی ، هەرچەندە مامۆســـتاکان بـــە کوردی وانەکان دەڵێنـــەوە بەڵام بۆ پێداچوونەوەی دەبێت لەســـەر پەرتوکە عەرەبیەکـــە بێت، پرۆگرامی خوێندن بۆتە هۆکارێکی تر چونکە خوێندن لـــە ئامادەییەکەمان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئامادەییەکانی تر و پرۆگرامی ئێمە هەر هەمووی خوێندنی تەندروســـتیە و ئەم گۆڕانکاریە شـــتێکی نوێیە لە لای قوتابی.

**مانای (پەرســـتار)یش لە لای من دایک و خوشـــکە وە کارێکی زۆر زەحمەتە و هەموو کەسێک ناتوانێت بیکات** ، ئـــەوەی بەئـــارەزووی خۆی نەبێت ئـــەوا ناتوانێت کاری پەرستاری بکات . لەکۆتایشدا هەرسەرکەووتووبن بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی پەرستاران.

**هەروەها رووناک ئەحمەد ئەســـعەد کە مامۆســـتایە لە ئامادەیی نەخۆشـــیاری کچان بەم شێوەیە هاتە ئاخاوتن :**

من بۆماوەی (١٦) شانزە ساڵە وانە دەڵێمەوە لە ئامادەیی نەخۆشیاری کچان و کوڕان ، شێوزای وانە ووتنەوەکانمان هەفتانە ســـێ ڕۆژ تیۆری و ســـێ ڕۆژ پراکتیکیە و پۆلـــی چوارەمیش تاکـــوو نیوەی ســـاڵ پراکتیکی لە ئامادەییەکەمان دەخوێنن پاشـــان لە نەخۆشخانە ئەنجامی دەدەن ، پۆلی پێنج و شـــەش وانـــەی پراکتیکی هەر لە نەخۆشخانە ئەنجام دەدەن بەپێی جۆری ئەو پرۆگرامەی کە وەری دەگرێت ودەچنە ئەو نەخۆشخانەیە.

سەبارەت بە ئاستی قوتابیان جیاوازە هەیانە ئاستیان بەرزە و هەیانە ئاســـتیان نزمە و هەیانە مام ناوندیە زۆریشیان توانیویانە بچنە پەیمانگا و کۆلێژی پەرستاری ، ئەوانەی ئاستیان نزمە دەتوانین گرنگیان پێبدەین بیان گۆڕین ، وە هۆکارەکانیشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرۆگرامەی خوێندن کە بەزمانـــی عەرەبیە ئەو وانانەی کـــە گۆڕدراوون لەم ساڵانەدا هەست کراوە کە قوتابی توانیوویەتی کەڵکێکی زانســـتی زۆری لێوەربگرێت وە ئەوانەی کە نەگۆڕدراوون پێویســـتیان بەگۆڕان هەیە و ئەمەش دەبێت بڕیاری لەسەر بدرێت .

هەروەها (عالیە یونس مستەفا) مامۆستا لە ئامادەییەکە ووتی: بەشـــێوەیەکی گشـــتی ئەو قوتابیانەی کە دێنە ئامادەییەکەمـــان ناوەندیان تەواو کردوە ئاســـتیان نزمە ، چونکـــە نمرەکانیان زۆر کەمن لـــەڕووی پرۆگرامی خوێندنیشەوە کێشەیەکی سەرەکیان هەیە چونکە خوێندن لـــەلای ئێمە بەزمانی عەرەبیە ئەو وانانە کە دەخوێندرێت چاپەکانیان زۆر کۆنە بۆ ساڵانی هەشتاکان دەگەڕێتەوە بـــە مانایی ئەم مادە زانســـتیانەی بەکاردێت زۆر کۆنەو گۆڕانکاریشی لەســـەر نەکراوە و هەر چەندە لە هەندێ وانەدا پەرتووکەکانی خوێنـــدن گۆڕانکاری کراوە بەڵام پێویستە هەر هەموو وانەکان و ئەو مادانەی کە تیایاندایە بگۆڕدرێت ، چونکە هەندێ بابەت هەیە لەئاستی ئەوەدا نییە کە قوتابی لەدوای ناوەندی بیخوێنێت ، **داواکاریشـــم کە پرۆگرامی خوێندنـــی ئامادەیەکەمان بگۆڕدرێت وە هەندێک بابەت وەربگێردرێتە سەر زمانی کوردی هەروەها** هیوادارم ئەو قوتابیانەی کە دێنە ئامادەیەکەمان ئاستیان بـــەرز بێت ، چونکە پەرســـتار مامەڵە لەگەڵ مرۆڤ و تەندروستی مرۆڤ دەکات .

دواتـــر چەند قوتابییێکی ئامادەیی نەخۆشـــیاریمان دواند سەرەتا:

**قوتابـــی (ژاڵە مەحمود عەزیز) ســـەبارەت بە هاتنی بۆ ئامادەیی نەخۆشیاری و ئاستی خوێندنی پەرستیاری وتی:**

قوتابخانە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ نەخۆشـــخانە چونکە ئێســـتا ئێمە قوتابین پێمان باشە گرنگی تەواومان پێ بدرێت ، سەبارەت بە پێشەی پەرستاریش بە لای منەوە پیشـــەیێکی زۆر پیرۆزە کارێکی مرۆڤایەتیە و بە ئارزووی خۆم هەڵم بژاردوە.

**هەروەها قوتابی (ســـارا فەرهاد) لە پۆلی چوارەم وتی :**

من بە ئارەزووی خۆم هاتووم بۆ بۆ ئامادەیی نەخۆشـــیاری

، سەبارەت بەئاستی خوێندنیش لەو ئامادەییە وتی : ئەو شتانەی لە قوتابخانە دەخوێنین لە نەخۆشخانە نی یە یاخود لە نەخۆشخانە جێ بەجێ ناکرێت سەبارەت بەپیشەی پەرستاریش من بەپیشەیەکی پیرۆزی دەزانم و شانازی پێوە دەکەم .

**دواتر قوتابی (سروە عەبدولجەبار) لە پۆلی شەشەم سەبارەت بە ئاستی خوێندن وتی :** لە ئامادەیی نەخۆشیاری شتی زۆر باش فێر دەبین هەموو شتێک دەربارەی پەرستاری دەخوێنین بەڵام بەداخەوە لە نەخۆشخانەدا شتێکی وا فێرنابین بە هۆی کەموو کوڕی زۆر لە نەخۆشخانەکان ، سەبارەت بە پیشەیی پەستاری من زۆر هەست بە خۆشی دەکەم کە ئەم پیشەیەم هەڵبژاردووە چونکە هەست ئەکەم خزمەتی خەڵک ئەکەم کارێکی مرۆڤایەتی ئەنجام دەدەم بەڵام دەبێت زیاتر لە ڕووی زانستیەوە گرنگی بەو پیشەیە بدرێت .



**(دلیڤان عومەر) کە یەکێکە لە قوتابیانی پۆلی شەشی ئامادەیی نەخۆشیاری خۆشحالی خۆی دەبڕی بۆ هاتنی بۆ ئەو قوتابخانەیەو وتی:** ئێمە بەشێوەیەکی زۆر باش بناماکانی کاری پەرستاری فێر دەبین و تاقیگەیەکمان هەیە شتی باشی تێدایە و شتی باشی تێدا فێردەبین بەڵام زۆر لەو شتانەی لە قوتابخانە دەخوێنین لە نەخۆشخانەکان پەیڕەو ناکرێت ، سەبارەت پیشەیی پەرستاریش زۆر خۆشحالم بە هەڵبژاردنی ئەو پیشەیە و شانازی پێوەدەکەم کە دەبمە پەرستار .

دواتر سەبارەت بە ڕۆڵی دەرچووانی ئامادەیی پەرستاری و کارکردنیان لە نێو نەخۆشخانەکان ڕاو سەرنجی چەند یەکەیەکمان وەرگرت لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن.

سەرەتا خاتوو ( ڕیزان مستەفا ) بەپرسی بەشی ڕووداوەکانی ئافرەتان ووتی : دەرچوانی ئامادەیی نەخۆشیاری کچان ڕۆڵێکی باشیان هەیە لە نێو نەخۆشخانەکان چونکە زۆربەی ئەو پەرستارانەی کە کۆن و ماوەیێکی زۆر لەنەخۆشخانەکان کاردەکەن دەرچووی ئامادەیین و خزمەتی هاوڵاتیان دەکەن لە هەموو نەخۆشخانەکانی کوردستان بۆیە پێویستە زیاتر گرنگیان پێبدرێت و بەردەوام بن لە پێشخستنی ئەو ئامادەییە.



**هەروەها خاتوو(گەشاو ئەنوەر) بەرپرسی پێشوازی ئافرەتان لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن سەبارەت بەڕۆڵی دەرچوانی ئامادەیی نەخۆشیاری وتی:** پەربتار چ دەرچووی ئامادەیی بێت چ پەیمانگا ئەگەر هەستی بەرپرسیاریەتی هەبێت دەتوانێت باشترین خزمەت بکات و بەکاری خۆی هەڵبستێت سەبارەت بە دەرچووانی ئامادەی نەخۆشیاری کەس نکۆڵی ناکات کە ڕۆڵیان چەند گرنگە لەنێو نەخۆشخانەکان بەتایبەتی بۆ ئافرەتان کە بەردەوام پێویستیان بەو دەرچوانە هەیە زۆربەی کەم و کوڕیەکانی کاری پەرستاری ئەوان پڕیان کردۆتەوە و سودی باشیان بە هاوڵاتیان و نەخۆشخانە گەیاندوە.



**خاتوو ( حەسیبە هەمزە ) لەبرینکاری ئافرەتان هەمان ڕای هەبوو وتی :** ئەو پەرستارانەی کە لە ئامادەیی نەخۆشیاری دەردەچن وەکو پەرستار ڕۆڵی خۆیان سەلماندووەو خزمەتی باش دەکەن ئەمیش بەهۆی ئەو سێ ساڵەی خوێندیان و شارەزاییان لەکاری پەرستاری بەڕاستی سودی باشیان گەیاندوە بە نەخۆشخانە و هاوڵاتیان.



# ساتێک لەناو نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری

**نەخۆشــخانەی هەولێری فێرکاری یەکێکە لە نەخۆشــخانە هەرە گەورەکانی شــاری هەولێر ، کە ڕۆژانە نەخۆشــگەلێکی زۆر ســـەردانی دەکەن و لەوێش بەپێی توانا چارەســـەر دەکرێن. ئێمــە وەکو گۆڤاری پەرســـتیاری بەپێویســـتمان زانی ئەم نەخۆشــخانەیە بەســـەر بکەینەوە و لە دەمی پزیشک و پەرستیار و کارمەندان و هاولاتیانەوە کێشــە و گرفتەکانیان بخەینەڕوو، لە وڵامی چەند پرســـیارێکدا بەم شـــێوەیە گەیشتین بە وڵامەکان.**

ڕیپۆرتاژ ـ شاهۆ خالید

**گەر بکرێت باسێکی گشــتی نەخۆشخانەکەتان بکەیت و پێشــمان بڵێیت بیرۆکـــەی هەڵبژاردنی ناوی ( هەولێری فێرکاری) بۆ ئەم نەخۆشـــخانەیە لەچییەوە هاتووە؟**

ســـەرەتا دکتۆر سەدرەدین شەمسەدین بەڕێوەبەری نەخۆشخانە لە وەڵامی پرسیارێکماندا بەم شێوەیە وڵامی داینەوە: ئەم نەخۆشـــخانەیە ساڵی ١٩٥٤ دامەزراوە بەناوی (نەخۆشخانەی مەلەکی هەولێر) پاشـــان لە ســـاڵی ١٩٥٨ بۆتە (نەخۆشـــخانەی کۆماری هەولێر) تا سەرەتای ساڵی هەشتاکان کە کۆلێژی پزیشکی کرایەوە لە زانکۆی سەلاحەدین ناوەکەیان گـــۆڕی بۆ (نەخۆشـــخانەی هەولێری فێرکاری). ئەم نەخۆشـــخانەیە زۆر فراوانە و لە چەندین بەشی گرنگ پێکدێت کە ئەمانەن: سێ بەشی سەرەکین:

١- بەشی نەشتەرگەری گشتی لەمانە پێکدێت:
أ- بەشی نەشتەرگەری گشتی.
ب - بەشی نەشتەرگەری مێشک.
ج - نەشتەرگەری چاو.
د - نەشتەرگەری لووت.
هـ - نەشتەرگەری شکست.
و - نەشتەرگەری جوانکاری.



٢- بەشی نەخۆشییەکانی هەناو ئەم بەشانە دەگرێتەوە:
أ- چاودێری چڕ.
ب - بووژانەوەی دڵ.
ج - گورچیلەی دەستکرد.

٣- بەشـــی دەروونی ،کە هەیکەلی بینایەی ئەم بەشە لە تەواو بوون دایە و بەڵێندەر بەجێی هێشتووە، چونکە دەڵێن زەرەری کردووە ، هەروەها لەناو شورای ئەم نەخۆشخانەیە

سێ کۆلێژی تێدایە. کۆلێژی پزیشکی، کۆلێژی پەرستیاری، کۆلێژی پزیشکی ددان ، ئەم کۆلێژانە گرفتی زۆری دروست کردووە بۆمان لەڕووی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کارەکانمان، چونکە دەرگای کۆلێژەکان بەردەوام والآیە، هەر بەوهۆیەوە ڕێکخستنی سەردانیش بۆ لای نەخۆش تێکچووە. سەرباری ئەوەش ئەم نەخۆشخانەیە نۆ دەرگای هەیە،

**+ ڕێژەی ئەو هاوڵاتیانەی ڕۆژانە سەردانی نەخۆشخانەکەتان دەکەن چەندە؟**

**ئەھرۆ سویحی/جێگری بەڕێوەبەر لە وڵامی ئەم پرسیارە وتی:**

ڕێژەیەکی دیاریکراو نییە، بەڵام زۆر زۆرە ، ئێستا تەنها لە راوێژکاریەکان نزیکەی (٤٠٠ تا ٥٠٠ ) هاوڵاتی سەردانمان دەکەن و ڕۆژانە زیاتر لە (٥٠) پەروەندە دروست دەکەین بۆ نەخۆش. ئەمەش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆری بەشەکانی ئەم نەخۆشخانەیە، لەهەمانکاتدا شوێنمان زۆر تەسکە. گرفتی زۆرمان بۆ دروست دەبێت لەگەڵ هاوڵاتیان، گرفتی سەرەکیمان لەگەڵ هاوڵاتیان ئەوەیە کە هاوڵاتی ئێمە ڕۆشنبیری تەندروستی نییە، یانی زۆر جاری وا هەبووە کە نەخۆش یاخود ئەوەی کە لەگەڵیەتی ڕەخنەی توند لە دکتۆر و پەرستاران دەگرن و زۆرجار لێیان تورە دەبن و وەک شتێک خۆیان دەکەنە بەدیلی دکتۆر و داوای حەب و دەرزی زیاتر دەکەن لەهەمانکاتدا دکتۆر نەزانێت ئەو نەخۆشە چەندە دەرمانی پێویستە.

**+کاری بەڕێوەبردنی بەشەکانی ئەم نەخۆشخانەیە تا چ رادەیەک زەحەمەتە؟**

- لە ولامی ئەم پرسیارە مافپەروەر جاسم اسعد قادر بەڕێوەبەری کارگێری نەخۆشخانە: وتی بەڕێوەبردنی ئەم نەخۆشخانەیە بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشخانەکانی تر زەحمەترە و هۆیەکەشی دەگێرمەوە بۆ چەندخاڵێک: ١- هەیکەلی بینایە لەسەر سیستمێکی کۆن دروستکراوە. ٢- بەشەکانی زۆرن و لێکیش دوورن، نزیکەی ٩٠٠ تا ١٠٠٠ کارمەند بە دکتۆر و پەرستار و...هتد لێرە کار دەکەن ،کەچی هێشتا گرفتی بەڕێوەبردن هەیە، هەر بۆیە زۆرجار داوامانکردووە کە گۆڕانکاریمان بۆ بکرێت و



لەسەر شێوازێکی ستونی نەخۆشخانەکەمان بینا بکرێتەوە. ٣- کەمی پێداویستیەکانی ناو نەخۆشخانە. من لە ڕێگای گۆڤارەکەتانەوە داوا لە حکومەتی هەرێمی کوردستان، (وەزارەتی تەندروستی) دەکەم زیاتر پەرە بە بەشەکانی نەخوشخانەکەمان بدەن و پێداویستیەکانمان بۆ دابین بکەن، بۆ نمونە ئامێری تیشکی (MRI) کە تەنها یەک ئامێری تیشکی وا هەیە لە شاری هەولێر زۆر پێویستیشە، داوا دەکەین بۆمان دابین بکەن.

**+ کاروبارەکانی پرسگە چۆنە ؟ ئەو گرفتانەی بۆتان دێتە پێش چییە؟**

- محمود عەبدولا: بەرپرسی پرسگەی نەخۆشخانە: دەوامی پرسگە سێ شەفتە، ٥٤ کارمەندی پرسگەشمان هەیە. کاتی سەردانی نەخۆش لە نەخۆشخانەکەمان هەموو ڕۆژێک کاتژمێر ٢ بۆ ٥ ئێوارەیە. ئەمەش بۆ ئاسانکاری سەردانی نەخۆشە. بەڕاستی پرسگە شوێنی خزمەتکردنی خەڵکە، بەڵام لەهەمانکاتدا دەبێ



هاوڵاتی هاوکاریمان بکەن، چونکە زۆرجار گرفتمان بۆ دروست دەبێ، بەتایبەت کاتی شوشتن و خاوێنکردنەوەی نەخۆشخانە سەردانی نەخۆش رادەگرین، یاخود جاری وا هەیە بریارێک دەردەچێت کە نابێ کەس ئۆتۆمبێل بهێنێتە ناو نەخۆشخانە هەتا کارمەندانی خۆشمان کەچی هاوڵاتیان دەیهێنن!. کێشەیەکی ترمان ئەوەیە میللەتی ئێمە عاتیفین، جاری وا هەیە هاوڵاتییەک نەخۆشەکەی لە ژووریّ توشی گرفتێک دەبێت بەشێوازێکی زۆر توند و ناشاسیتە رووبەرووی ئێمە دەبێتەوە، داواکارم لە هاوڵاتیان کە رێزی پرسگە بگرن و لەو کاتانەی کە بۆیان دانراوە سەردانی نەخۆش بکەن، ئێمەش بۆ خزمەتی ئەوان کار دەکەین و سوپاسیان دەکەین.

**+ پەرستاران تا چەند رۆڵیان هەیە لە خزمەت کردن و بەرەوپێش بردنی رەوشی تەندروستی؟ ئەو گرفتانەی بۆیان دێتە پێش چییە؟**

- ئیبراهیم احمدقادر سەرۆکی پەرستیارانی کورد وتی: بەڕاستی پەرستیار رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە بەرەوپێشبردنی رەوشی تەندروستی، جێبەجێکردنی ئەم رۆڵە پیرۆزە لە پەرستارێکە بۆ پەرستارێکی تر جیاوازە، پەرستار هەیە رۆڵەکەی زۆر بە جوانی دەگێڕێ. پەرستاریش هەیە



کەمتەرخەمە، پەرستاریش هەیە مامناوەندییە. گرفتی گەورە کە بۆ پەرستار دێتە پێش لەگەڵ ئەو خەڵکە دایە کە سەردانی نەخۆشەکە دەکەن.

**+ رۆڵی کۆمەڵەی پەرستیاران لەناو نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری چییە؟**

- (هەرێم عومەر کاکل) لە نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری: کۆمەڵەی پەرستاران ماوەی دوو ساڵێکە دامەزراوە، هەر پەرستیارێک مافی ئەوەی هەیە ببێتە ئەندامی کۆمەڵە. ئامانجی کۆمەڵەکەمان کۆکردنەوەی پەرستاران و دەرخستنی گرفتەکانی پەرستار و چارەسەری گرفتەکانیان بەپێی



توانا. ئێمە چەندین کار و چالاکیمان ئەنجامداوە لەناو نەخۆشخانە، بۆ نموونە، کردنەوەی وۆرک شۆپێک کە تایبەت بوو بەوەی پەرستیار چۆن مامەڵە لەگەڵ نەخۆش بکات، وە هۆشیاری بە نەخۆش بدات و دڵی نەخۆش و کەسوکاری بداتەوە. وە سازدانی سیمیناری زانستی بۆ کەسانی شارەزا، ئەوانەی کە لە دەرەوەی وڵات خولیان خوێندوە، ئێمەش سیمیناری بۆ سازدەکەین بۆ ئەوەی، ئەوەی کە فێری بوون بیدەنەوە بە نەخۆشخانەکانی خۆمان، هەندێک جاریش خولی وەرزشیشمان کردۆتەوە.

**+ تۆ وەک هاوڵاتییەک تاچەند لە کارەکانی ئەم نەخۆشخانەیە رازیت؟**

محەمەد عەلی: دەست خۆشی لە بەرێوەبەرایەتی نەخۆشخانە دەکەم ، بێگومانم لەوەی بەردەوام لەخزمەتی هاونیشتمانیاندان ، بەڵام کۆمەڵێ کێشەوگرفتیان هەیە ئیتر هەر لەکەمی پێداویستیە پزیشکیەکان بگرە تازۆر شتی تریش.

. شنۆ جمال قادر: راستە بەردەوام خزمەتی ئێمە دەکەن بەڵام زۆر جار مامەڵەی برایانی پرسگە باش نیە . دەست خۆشی ماندوونەبوون لە سەرجەم دکتۆر و پەرستاران دەکەم

. پەرژین کمال احمد:باوەرناکەم هەرچیەک لەدەستەلاتی ئەواندا هەبێ بۆ نەخۆش ئەنجامی نەدەن ، بەڵام نەبوونی دەرمان یان هەندێ پشکنین ئەمە گرفتەکەیە ، بەتایبەت ئەگەر یەکێک خەلکی شاری هەولێر نەبێ ، چونکە شارەزا نیە.

## نەجات تاهیر :

# خۆشەویستیم بۆ کارەکەم پاڵپشتێکی گەورەیە

مرۆڤ دەتوانێ لەو پیشەیە سەرکەوتن بەدەست بێنێ کە خۆشی دەوێت و لەگەلی ئاوێتە دەبێت ئەو پیشەیەش دەتوانێ بەردەاومی هەبێت و بمێنێتەوە کە خەلک پێویستیان پێ هەبێت سودیش بە خاوەنەکەی بگەیێنێ ، بێگومان پەرستاریش یەکێکە لەو پیشانە چونکە لە هیچ باروداخ و کات و زەمەنێک نی یە بلێین پێویستیمان بە پیشەی پەرستاری نابێت خاتوو (نەجات) یش خۆشەویستی بۆ پیشەی پەرستاری وای لێکردووە کە ماوەی (٢٠) ساڵ لەو پیشەیە دانەبراوە و تاوەکو ئێستا خۆشەویستی ئەو پیشەیە گوڕ و تینی زیاتری پێ بەخشیوە لە بەسەر کردنەوەیەکدا بەم شێوەیە بۆمان دوا.

دیمانە - سوهام عەلی

**+ نەجات حسن تاهیر کێ یە ؟**

- خەلکی رەواندوزم لەسالی ١٩٦٣ هەرلەرەواندوز لەدایک بووم ژیانی منداڵیشم هەر لەوێ بەسەربردووە و لەبنەماڵەیەکی سادەو و کوردپەروەر ژیاوم.

**+ کەی دەستت بەکاری پەرستاری کردووە؟ و بۆچی؟**

- لەسالی ١٩٨٤ چوومە قوتابخانەی پەرستاری لەهەولێر بۆ ماوەی (٣)ساڵ خوێندم و وانەکانیشمان پراکتیکی و تیوری بوو لەسالی ١٩٨٧ دامەزراوم،وەکاری پەرستاریشم وەکو پیشەیەکی مرۆڤ دۆستی زانیوە و پەرستاریشم بەخۆشەویستی خەلکی ناسیوە بۆیە ئارەزوی کاری پەرستاریم کردو و هەڵم بژارد.

**+ کێن ئەو کەسانەی هاوکارت بوون بۆ هەڵبژاردنی پیشەکەت؟**

- باوکم وەک باوک و دواتریش وەک هاوکار بەردەوام هاندەرم بووە چونکە هەستی بەوە کردبوو کەخۆشەویستیەکی زۆر لەناخمدایە بۆ پیشەی پەرستاری.

**+کاری پەرستاری رێگر بووە لەژیانت دا؟**

- نالێم رێگر بەلام زۆرێک لە لایەنەکانی ژیانی خۆمم فەرامۆش کردووە و کاتێکی زۆرم بۆ خزمەتی پیشەکەم تەرخان کردووە.

**+ پەشیمان نیت لەوەی بڕیارت داوە ؟**

- نەخێر لەگەڵ ئەوەی بەپیشەکەم ژیانمی پێ دەگوزەرێنم و کارێکی مرۆڤانەشە و خێریشە نابێ ئێمە تەنها بۆ ژیانی دونیایی کاربکەین دەبێ خواش لەخۆمان رازی بکەین بەو پیشە بەدڵ سافی و نیەت پاکی کاربکەین.

**+ رەوشی پەرستاری چۆن دەبینی ئێستا لەکوردستان بەجیاواز لەگەڵ سالانی پێشوودا؟**

- گۆڕانێکی ئەوعی باش کراوە لەزۆر شت ئەگەر سەیر بکەین هەر لە بەرەوپێشەوە چوونی زانستی پەرستاری و تێروانینی کۆمەڵگاکەمان لە گەڵ ئێستادا چونکە پێشان زۆر ئاستەم بوو ئافرەت لەو بوارەدا کاربکات.

**+ خالی هاوبەش لەنێوان تۆ وپیشەکەت دا چی یە؟**

- تەنها خزمەت کردنە.

**+ ژیان لای تۆ چی دەگەیێنی؟**

- ئەو کاتە هەست بەتام وچێژی ژیان دەکەم کە خزمەتی خەلک و پیشەکەم دابم بەراستگۆی رێزی خەلک بگرم و ئەوانیش خۆشەویستیان هەبێ بۆ ئەو مرۆڤەی کەپێی دەلێن پەرستار.

**+ پەرستاری سەرکەوتوو کێ یە؟**

- ئەو پەرستارەیە کەبتوانێ بەویژدانەوە کارەکانی راپەڕێنی و لەو ئاراستە جوانەی پەرستاری دوانەکەوێ،دەست پاک و سادەبێ لەگەڵ هاوڵاتیدا.

**+ لەچەند شوێن کاری پەرستاریت کردووە؟**

- لەپێشوازی ئافرەتان لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن دواتر لەبنکەی تەندروستی (هەنجیروک)لەگەڵ کاتێ رژێمی بەعسی لەناوچوو کوێتی داگیرکرد لەسالی ١٩٩٠ بەکەرەت رەوانەی ئەوێ کراین بۆ ماوەیەک لەنەخۆشخانەی (ئەحمەدی) بووین و دواتر لەنەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن



لەبەشی نەشتەرگەری و ئێستاش لەیەکەی گورچیلە کاردەکەم لەهەمان نەخۆشخانە.

**+ لەژیانی پەرستاریدا لەچی پەشیمانی؟**

- لەهیچ شتێ پەشیمان نیم لەگەڵ ئەوەی بەدرێژای(٢١)ساڵ لەکاری پەرستاریدا نیشگگری شەو بووم خۆشەویستیم بۆ کارەکەم پاڵپشتێکی گەورەیە.

**+ چی بەو پەرستارە تازانە دەڵێیت کەدێنە ناو ئەم پیشەیە؟**

- خزمەت بکەن و پیشەکەی خۆیان خۆش بوێ تا ویژدانیان ئاسودە بێ.

**+ دوا وتەت ؟**

- لەرێگای گۆڤارەکەتانەوە داوا لەدەستەلاتی تەندروستی دەکەم گرنگی زیاتر بەپەرستار بدەن چونکە ئەو کەسانەن لەژیاندا لەزۆرشت بێ بەشن هاوکارمان بن بۆ ئەوەی زیاتر خزمەت بکەین . و سوپاس بۆ ئەم بەسەر کردنەوەی گۆڤاری پەرستار.

مسعود شێخ وەسانی

# زۆر دیمەن لە کاری پەرستاری دەبنە ئیلهامی شیعر



**زۆر جار مرۆڤ لەپاڵ ئەوکارەی ئەیکات وەک پیشە،خولیاو و بەهرەیەکی تایبەتی هەیە و هەوڵیش ئەدات بۆ ئەوەی بتوانێت تێیدا سەرکەوتوبێت لە ئارەزووەکەی،پەرستارانیش بەدەر لەو ئەرکە مرۆییەی کەهەیەتی، زۆر جار بەهرە و ئارەزوویەکی هەیە و هەوڵی بۆ ئەدات. لەکاتێک دا شیعر زێدی ڕێحە لەنیو دوورگەیەکی پڕلەنهێنی و لەنێو کۆمەڵە رازێکی شاراوەدا پەنگ دەخوات و لەدەمی خامەی شاعیردا ئەمونرێتەوە.(مسعود شێخ وەسانی)سەرباری کاری پەرستاری خۆی کەسێکە لەنێو ئەم دوورگەیە پڕ لەنهێنیە کە جیهانی شیعر خۆی ئەبینێتەوە و تاکو ئێستاکە خاوەنی دوو بەرهەمی شیعریە بەناوی(بوکی خەیاڵ) و (ئاوابووم و هەڵاتمەوە) بەچاکمان زانی ئەم بەهرەمەندەی شیعر بدوێنین:**

دیمانە - هەرێم عومەر کاکل

**+ لەسەرەتادا حەزدەکەین بزانین (مسعود شێخ وسانی)کێ یە ؟**

.من مسعود جلال رەحمان خەڵکی گوندی شێخ وەسانی شەهیدم لەساڵی ١٩٨١ لەشارۆچکەی هەریر لەدایک بوومە و دەرچووی پەیمانگای تەکنیکم لەبەشی پەرستاری.

**+ بەهرەی شیعرنووسین لەکەیەوە لەلات سەری هەڵدا؟**

. لەساڵی ١٩٩٦ دوە شیعر دەنووسم و یەکەم شیعریشم هەرلەو ساڵە نووسی.

**+ شیعرەکانت لەچ روویەکەوە رەنگی داوەتەوە؟**

. ئەوەی لەشیعرم رەنگی داوەتەوە ناخمە،واتە هەرکەسێک بیەوێ ناخی من بخوێنێتەوە و رووی رەنگدانەوەی شیعرەکانم بزانێ ئەوا بەخوێندنەوەی شیعرەکانم من دەخوێنێتەوە و دەشزانێ من چیم خۆش دەوێ و رقم لە چی یە، حەزم لەچ دانیشتنێکە و لەکام دانیشتن بێزارم،چ بۆنێکم پێ خۆشە و بەکام بۆن دەرشێمەوە،وحەزم لەکام دەنگەو لەچ دەنگێک بێزارم،شەوم خۆشتر دەوێ یان رۆژ...هتد،

**+ (بوکی خەیاڵ) بەرهەمی یەکەمی شیعرت بووە،سەرەتای کاری بڵاوکردنەوەشت بوو؟چۆن باسی ئەم سەرەتایەمان بۆ دەکەی؟**

. (بوکی خەیاڵ) یەکەم بەرهەمی شیعریمە و نۆبەرەی کاری بڵاوکردنەوەشمە،چاپی یەکەمی ئەم کتێبە (٥٠٠) دانە بوو بەچەند مانگێک لەکتێبخانەکان نەما،بەڵام نیازم وایە ئەگەر دەرفەتێکم بۆ برەخسێ چاپی دووەمی بکەم بەجیاوازی تیراژ وسیمایی بەرگ و کۆمەڵێک گۆرانکاری ڕوخساری و ناوەرۆکی چونکە زۆر بەداخەوە وێرای ماندووبونێکی زۆر و تەقەلایەکی بێ وێنە کەچی زۆر هەلەی چاپی تێکەوت کەدەبێ لەچاپێ دووەم بەپوختی وخالی لەهەڵە چاپی بکەمەوە.

**+ پێت وانیە(بوکی خەیاڵ)سۆزی لێ ئەتەکێ؟**

.لەبەرئەوەی من دەڵێم شیعر لەمناڵدانی وژدان پێدەگا و لەدایک دەبێ، بۆیە لەژێر رۆشنایی ئەو ڕستەیەی سەرەوە دەبێ شیعرسۆزی تیابێ و مەحالیشە شیعر سۆزی تێدانەبێ،من

ئـەوەی گوژتوومە و ئـەوەی دەیلێم و ئەوەی نیازیشـمە بیلێـم خاڵی نابێ لەسـۆز هەرئەمەشە سەرنجی خوێنەر رادەکێشـێ بۆ تێکەڵ بوون لەگەڵ شـیعر و خۆ بینینەوە لەناوڕنەکانی ناونیشان.

**+ بەرهەمـی دووەمت(ئاوابــووم و هەڵاتمــەوە) بۆ ئــەم ناونیشــانەت هەڵبژارد؟**

. مەبەسـت لە ئاوابووم واتا: کۆتایی هاتن بەخۆشەویستی ومردنی ئاواتێکی گەورەتــر لەژیــان و لەسـێدارەدانی حەزێک بەپەتی ووشـەیەکی لەدەم تاڵ و پاشـینە کفن کردنی بەخامی خۆزگە.

هەڵاتمــەوە : مەبەسـتم دووبــارە ژیانەوەیە،دووبـارە لەدایـک بوونی خۆشەویسـتیە و ژیانەوەی حەزێکی دیکەیــە لەهەمــان لەشــی حەزی پێشووتر.

**+ پێت وانیە بەرهەمی دووەمت زیاتر رووچوونە بەنێو ناخ و هەست وچاکترە لەبەرهەمی یەکەمت؟**

. خەڵکیــش وام پــێ دەڵێن،هەڵبەتە وایە.

**+ شیعر نووسـین وپەرستاری چۆن توانیوتــە بەیەکــەوە بیــان لکێنی؟ لەکتێبـی دووەمیشـت پێــم وایــە دیمەنێـک هەیــە کەتــۆ لەکاتی کارەکەتــدا لەنەخۆشـخانە بینیوتە و کردوّتــە بەشـیعر، هەڵبەتە تۆی هەژاندووە؟ئەمەچۆن بووە؟**

. شـیعر بەهرەیە و پەرستاریش کاری رۆژانەیە،ئەگەر بلێم هیچ لکاندنێک لەنێوان شیعر وپەرستاریدا نەبووە لەلام راســت ناکــەم چونکە ئــەو کاتەی لەبەشــی نەشــتەرگەری شکــست بووم لەکاتی هێنانــی بریندارەکانی کارەتیرۆریســتیەکەی بەردەم ناوچەی هێزی ناوخۆ دیمەنێک هەژاندمی کە بووەهۆکاری لەدایک بوونی شیعرێکم و هەر ئەودیمەنەشــە کەتۆ پرســیارم لەبارەیــەوە دەکەی ،ئــەم دیمەنەش لەچیرۆکــە شــیعری (زامەکەی سەختە)لەکتێبی ئاوابووم و هەڵاتمەوە باسم کردووە.

**+ جگە لەشــیعر نووسین بیستومانە بەهرەی تریشت هەیە؟**

. بەڵــێ خۆشــنووس و وێنەکێشــان وەژەنینی ئالەتی ساز.

**+ دواپەیڤت بۆ گۆڤارەکەمان؟**

. یا خوا هەر سەرکەوتووبن و سوپاسیش بۆ جێکردنەوەی چەند ووشەیەکم لەسەر لاپەرەی گۆڤارەکەتان.

**+ دیاری شیعریت بۆ گۆڤارەکەمان؟**

. بەچاوان.

**تازە ناشێ**

تازە ناشێ بۆ یەک ببین
وەک چۆن ناشێ دڵم شادبێ
وەک چۆن ناشێ
من تۆم لەبیر بچێتەوەو
تۆش یەکجارمنت لەیادبێ
تازە ناشێ بۆ یەک ببین
وەک چۆن ناشێ
من تۆم لەبیربچێتەوە
وەک چۆن ناشێ
خۆر لەشوێنی خۆرئاوابوون هەڵبێتەوە
لەبەرگەورەیی و پیرۆزیت
رازی بووم بەهەموشتێکت
گریاندمت
سووتاندمت
جارێکیش لێت تووڕە نەبووم
جارێکیش من
لەحوزووری تۆ هەڵنەچووم
ژین جارێکە
ئەویشم کرد بەقوربانت
چۆن دڵت هات جێم بهێڵی
چۆن رێگای پێ دا ویژدانت
چەند بەڵێنی جوانت پێدام
تێنەگەیشتم
بۆ ئاوا دوورت فڕێ دام
کاڵی تازە خۆشم ویستووی
هەرچی بڵێ ی
هەرچی بکەی
بەڵێن بەهەرکەسێک بدەی
خۆشەویستیت رێم پێنادا
لەبیرخۆمت ببەمەوە
فەرهەنگی یادگاریەکانت
دوور فڕێ دام
شتی کۆن لێنەدەمەوە
کاڵێ ئێستاش
هەرخەمی داهاتووی تۆمە
هەربەپاکی خۆشم ئەوێ ی
وەکو جارانیش راستگۆمە
من گرنگ نیم
تۆ گرنگی
ئێستاش ئەگەر ئەو بتوانێ
منت لەبیر بباتەوە
بیابانی تینووی ناخم
دەریایەک ئاو ئەخواتەوە
من گرنگ نیم
تۆ گرنگی
ئارەزوومە
خوا دەزانێ ئارەزوومە خۆشبێ ژیانت
ئارەزوومە ئەوەنــدەی من تۆی خۆش بوێ
دەستگیرانت.

# لەسەر پشتی کیسەڵ تا ئێرە هاتین



ئەگەر کاری ڕێکخراوەیی بریتی بێت لە ممارەسەکردنی [بیر]کراسی و وەبەرهێنانی [کە]سێکی گونجاو بۆ دەسەلات [ڕێ]نگای ڕێکخراوەکانی ناحکومی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی [پەیڕەو]ی بە جەماوەروە بکات ئەوا بۆ ئێمە ئەوانەی لەو ڕێکخراوانە کاردەکەن و ئەوانەی کە پێیان دەڵێن سەندیکا و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان هیچ پێناسە و جێکەوتێکمان نییە لە [کۆمەڵگا]ی دەسەلاتدا کە جێگای بایەخ [و ئیهتیمام بێت بۆیە] هەمیشە ڕێکخراوەکان ڕەخنە لە حکومەت دەگرن و لە بەرامبەریشدا دەسەلات و حکومەت ڕێکخراوەکان بە ناچالاک ئەژمار دەکەن و ڕەخنەیان لێ دەگرن بۆیە هەمیشە دەسەلات لە بۆسەدایە کە ئاڵەتێک بدۆزێتەوە و بیکاتە بیانو بۆ برینی ئەو هەر کارێک ... ڕێکخراوەکان من ناڵێم دەبێت حکومەت سەندیکا و ڕێکخراوەکان بژێنێ لە هەموو وڵاتێ کۆمەڵەو سەندیکاکان وەکو کەرتی تایبەت پرۆژەی ... زانجەکەی خۆیان دەژێنن بۆیە ... باری داخوازیەکانی حکومەت ... ئێمە لە کاری ڕێکخراوەیی ... لەبەردەم چالاکی و بزاڤی کاری ڕێکخراوەیی و سەندیکایی لە وڵاتی ئێمە ئەمیش تەنها لەبەر ئەوەی ... ڕێکخراوەکانی ئێمە حکومەتە لە حکومەت ... لە پشت ئەو ڕێکخراوانە ... چالاکی ... کرێت و نە دەتوانێت بە تەواوی ... بدات بۆ نمونە سەندیکای پزیشکان وەزیری تەندروستی کە پزیشکە لە پشتیانە و زۆربەی کارەکانی لە ڕێگای وەزارەتەوە بۆیان دەکرێت ... سەندیکای ژمێریاران کە سەرۆکی سەندیکایی ژمێریاران ... کاری وەزیرە و کارەکانیان تا ئەو ... دەچێت و جگە لە کاری حکومی کاری ... بۆ ئەندامانی خۆیان دۆزیوەتەوە لە سەندیکا و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی تر و وەکو ... داناوە کە دەبێت لە هەر ڕێکخراوێکی نا حکومی کە دەرماڵە (منحە) لە حکومەت وەرگرێت دەبێت ژمێریارێکی دەبێت و خاوەن بڕوانامەی ژمێریاری بێت و ئەندامی سەندیکای ژمێریاران بێت بە کورتی دەبێت ئەندامێکی سەندیکایی ژمێریاران کارەکانیان بۆ ڕاپەڕێنێ

وەکو فەرمانبەرێکی هەمیشەیی لەو ڕێکخراوانە ، ئێمەی پەرستارانیش کە توێژێکی هەرە خزمەت گوزاری نێو دەزگاکانی تەندروستی یە تەنانەت کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەش لەسەر ئەرک و گیرفانی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بووە و تاوەکو ئێستا دوو لقی سلێمانی و دهۆکی کردۆتەوە بێ ئەوەی فلسێک لە حکومەت بۆیان دیاری کرابێت ئەو هاوکاریەی کە ئەو لقانە وەردەگرن بەشێک لەو دەرماڵە پێیان دەدرێت کە بۆ دەستەی باڵای کۆمەڵە دیاری کراوە ، ئەمە سەرەرایی ئەوەی کە ئێمە گۆڤارێکی وەرزیمان هەیە کە ئێستا لەبەر دەستان دایە کاتی خۆی لە وەزارەتی دارایی بڕیاردرا کە مانگانە پارە بۆ دەرچوونی گۆڤاری پەرستار خەرج بکرێت بەڵام لەبەر ڕۆتینیات نە ئێمە توانیمان مانگانە ئەو بڕە پارەیە وەربگرین نە وەزارەتی دارایی ئامادەبوو مانگانە ئەو بڕە پارەیە بداتە کۆمەڵەکەمان ناچار گۆڤارەکەمان کردە گۆڤارێکی وەرزی و پارەکەش لەسەر بودجەی دیوانی وەزارەتی تەندروستی خەرج کرا ، بۆ ئەم ژمارەیەش بۆ ماوەی سێ مانگ دەبێت ئێمە خەریکی ڕوتینیاتی وەرگرتنی ئەو پارەیە بووین هەر جارە و هەنجەتێک جاری وا هەبوو بۆ واژوویەیەک دەبوایە دوو هەفتە چاوەڕێ بکەی سەرەرایی ئەشارەزیی کارمەندانی نوێی دیوانی وەزارەتی تەندروستی کە دوو جار دوو فەرمانی کارگێڕیان لە بیرچووبوو دەری بکەن بۆ دەستەی هاوبەشی دارایی ، ئەمانەی باسمان کرد بەشێک بوون لەو ئەرکانەی کە دەبوایە ئێمە ڕایپەڕێنین تەنها ئەو ڕێگایەشمان لە پێش بوو ئەوەی دەکرێت بۆ کەمەڵەکەمان دەبێت بە پارانەوە بێت پارانەوەش جورئەتی دەوێت بۆیە ئەوەی لەبەر دەممان ماوە تەنها ڕێگایەکی ترە ئەویش بە پشت بەستن بەخۆمان بەو پەرستارانەی کە ئەندامی ئەو کۆمەڵەیەن ، ئەمیش بەوە دەرکرێت کە پەیوەندیەکی پتەو هەبێت لە نێوان ئەندامان و دەستەی باڵاو لقەکان چونکە دەستەی باڵای هەر سەندیکا و کۆمەڵەیەک هیچی پێناکرێت ئەگەر ئەندامانی خۆی لەگەڵ نەبێت و پاڵپشتی نەکرێن لە هەڵوێست و داخوازیەکانیان ئێمەی کارمەندانی تەندروستی کێشەی سەرەکیمان ئەوەیە کە یەک دەنگ نین کاتێک کە داوای مافی خۆشمان دەکەین بە پارانەوە داوا دەکەین لە کاتێکدا ڕێگای تر هەیە دەتوانی بە فشاری مەدەنیانە و مانگرتنێکی هێمنانە زۆرێک لە مافەکان دەستەبەر بکەین بەڵام مەرجی سەرەکی سەرکەوتن و دەستەبەر کردنی مافەکان پەیوەندی نێوان ئەندامان و کۆمەڵە و پەیوەندی نێوان کارمەندان خۆیەتی لەگەڵ بوونی جورئەتی بڕیاردان لەکەسایەتی هەر یەکێک لە ئێمەی پەرستار بۆ هەر هەڵوێست و هەنگاوێک لە کۆتایدا هیوادارم بە هەڵە لێم تێنەگەن.

# هەمووممان لە هەوڵی گۆڕینی سیستەم داین بەڵام !

٢



بەڕێوەبەری نووسین

گۆڕینی سیستەمی تەندروستی پرسێکە میژینەیەکی درێژی هەیە بەنسبەت ئێمەی پەرستارەوە لەوانەیە بپرسن کە ئێمە بۆچی ئەوەندە باسی گۆڕینی سیستەمی تەندروستی دەکەین تۆ بڵێ ی بەنسبەت ئێمەوە شتێکی ئەوەندە گرنگ بێت ، گومان لەوەدا نی یە کە بوونی هەر دامەزراوەیەک لەسەر کۆمەڵێك بنەمایی یاسایی و سیستەمێکی کارگێری دامەزراوە و کاری لەسەر دەکات بە پێی گۆڕانی بارودۆخ و زەمەن ئەوسیستەمەش گۆڕانی بەسەردا دێت ، ئەوەی کە پەیوەندی بە سیستەمی تەندروستی یەوە هەیە ئەوە جێگی بایەخی ئێمەیە بۆ وڵامی ئەو پرسیارەی کە ئایا ئێمەی پەرستار بۆچی ئەوەندە بەتەنگ گۆڕینی سیستەمی تەندورستی یەوەین پێم وایە بۆ ئێمە ئەوە خاڵێکی هەرە گرنگە چونکە ئەو سیستەمەی ئێستایی تەندروستی بەرای ئێمە پەیوەندی یەکی زۆر نا تەندروست دیار دەکات لە نێوان و پزیشك و پەرستار لە لایەك و لە نێوان پەرستار و پیشەکە لەلایەکی تر ئەم دۆخە ناتەندروستەش کاری کردۆتە سەر تەواوی لایەنەکانی ژیانی پەرستار چ لە لایەنی دەرونی و کۆمەڵایەتی یەوە بێت چ لەلایەنی زانستی و کارەکەیەوە بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو دۆخە نا تەندروستەش پێویستمان بەگۆڕینی سیستەمی تەندروستی هەیە رەنگە هەندێك کەس بڵێت ئاخۆ ئەو سیستەمە چی تێدایە بۆچی جێگای رەخنەیە لەلایەن پەرستاران لەمەشدا ناحەقمان نەگرن چونکە ئەو سیستەمە کاتێك لەعیراق دانراوە کە رەنگە پەرستاران بە پەنجەی دەست دەژمێردران و ئەوکات نە کۆلێژی پەرستاری هەبووە نە پەیمانگای پزیشکی هەر لەوکاتەوە پەیوەندی یەکی نا تەندروست لەنێوان ستافی تەندروستی دانراوە تاوەکو ئەمڕۆ کە ئێستاش ئاسەوارەکانی خۆی هەر ماوە و پزیشکان بە چاوێکی زۆر نزم سەیری خوار خۆیان دەکەن بە شێوەیەك هیچ کاتێك پەرستار بە تەواوکەری خۆیان دانانێن ، ئەمەیە ئەو حاڵەتە نا تەندروستەی کەپێمان وایە دەبێت گۆڕان بەسەر ئەو تێروانینەدابێت ئێمـەش پێمان وایە تەنها بە گۆڕینی سیستەمی تەندروستی دەکرێت ئەو چەمك و تێروانینانە راست بکرێنەوە ، بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجی ئێمەی راکێشاوە ئەوەیە کە هەر لەوکاتەی حکومەتی هەرێم دامەزراوە بە تایبەتی دوای کابینەی چوارەم تاوەکو ئەمڕۆی لەگەڵدا بێت هەموو بەرپرسانی وەزارەتی تەندروستی بەتایبەتی وەزیری تەندروستی لە هەموو کابینەکانی حکومەتدا هەر کاتێك باسمان لە ئاریشەکانی پەرستاران وئەو ئاستەنگانەمان کردبێت کە دێنە بەردەم کاری پەرستاری و پەرستاران یەکسەر ئاماژە بە نا تەندروستی سیستەمی تەندروستی دەکرێت هەمووشیان لە هەموو کابینەکاندا بەڵێنی گۆڕینی ئەوسیستەمەیان داوە و بەڵام جێ بەجێیان نەکردووە لێتان نە شارینەوە هەرکاتێکیش ئێمە وەك پەرستارێك رووماڵ لەهەر شوێنێك کردبێت بۆ لای هەر بەرپرسێکی تەندروستی باسی گۆڕینی سیستەمی تەندروستیمان کردووە یەکێك بووە لە داخوازیە سەرەکیەکانمان کەواتە هەمووممان لە هەوڵی گۆڕینی سیستەمی تەندروستیدایین بەڵام کێن ئەوانەی بریار دەدەن و جێ بەجێ ی دەکەن ئەمەیان بۆ ئێمە خاڵێکی زۆر گرنگە چونکە ئەو سیستەمە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نی یە بەڵام لەوانەیە زۆر لە بەرژەوەندی ستافی تری تەندروستی بە تایبەتی پزیشکاندا بێت کەواتە گۆڕینی تەنها لە بەرژوەندی ئێمەدا دەبێت و هاوکاتیش لەبەرژەوەندی هاوڵاتیان چونکە هاندەرێکەبۆ ئەوەی پەرستار زیاتر خزمەتی نەخۆش بکات و خۆی بەخاوەنی بزانێ و سەلامەتی ئەو بخاتە ژێر بەرپرسیارێتی خۆی کەوایە ئەگەر وابێ ئێمە نەك تەنها بەرژوەندی خۆمان دەوێت بەرژەوەندی هاوڵاتیانیش بە جۆر و چۆنی یەتی خزمەتی پەرستارەوە بەندە بۆیە ئێمەی پەرستار هەمووممان لە هەوڵی گۆڕینی سیستەمی تەندروستیدایین بەڵام کێ پاڵپشتیمان دەکات کێ یە ئەوەی گوێمان لێ دەگرێت بۆ ئەمەش پێم وایە کەتەنها خۆمان دەتوانین ئەو گۆڕانکاریە بکەین خۆمان پاڵپشتی یەکتر بین بۆ فشار خستنە سەر بەرپرسانی تەندروستی بۆ گۆڕینی ئەو سیستەمە ئەمیش بە پاڵپشتی کردنی یەکتری و کۆبوونەوەمان لە یەك میمەبەری رێکخراوەیی خاوەن بنکەی بەهێز بۆ ئەوەی هەر کاتێك بریاری ئەوەی دا کە چیتر نەچێتە ژێرباری ئەو سیستەمە ئەندامانی پەیرەوی لێ بکەن و لە هیچ کاردانەوەیەك نەترسێن ئەوکاتەش دەگەینە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە هەمیشە لە دەمی بەرپرسانی تەندروستی بیستومانە کەدەڵێن ئێمە دەمانەوێت سیستەمی تەندروستی بگۆڕین بەڵام...بەڵام...بەڵام فلانە شت رێگرە ئێمە ئەگەر چاوەرێ ی ئەو هەموو( بەڵام)مانە بکەین لە کۆتاییدا لە جیاتی بەرسینگ(صدریە) ی سپی دەبێت رەنگی شین یان پەمبەیی لەبەر بکەین.

# NEW VISION EYE CENTER





بنکەی بینایی نوێ بۆ چاو

مرکز الرؤیة الجدیدة للعین

**بۆ چارەسەرکردنی چاو بە تیشکی لێزەر و نەشتەرگەری کردن بە تازەترین ئامێری چاو وە (ڤاکۆ)**

**علاج العين بأشعة الليزر واجراء العمليات باحدث الاجهزة الطبية و ( فاكو )**



ئەنجامدانی نەشتەرگەری بە ئامێری (ڤاکۆ) بۆ هەڵگرتنی ئاوی سپی
بەبێ ئەوەی نەخۆش سڕبکرێت بەتایبەتی ئەوانەی نەخۆشی شەکرە یاخود فشاری
خوێنیان هەیە لەهەمان کاتدا پێویستیان بەنەشتەرگەری چاو هەیە



بە بەڕێوەبەرایەتی و سەرپەرشتی
سەڤین جاسم محمد



چارەسەرکردنی نەخۆشی دووربینی و نزیک بینی چاو
بەبێ ئەوەی چاویلکە لەچاو بکرێت بەتایبەتی
بۆ ئەوانەی حەز ناکەن چاویلکە لە چاو بکەن



بنکەی بینایی نوێ بۆ چاو
ناونیشان: هەولێر ڕێگای کەرکوک
نزیک هۆڵی ڕۆشنبیری

چاپخانەی منارە - هەولێر